دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **ئیمپراتۆرییەتی ئیران**
- نووسینی: دان ناردۆ
- وەرگێڕ لە فارسییەوە بۆ کوردی: فەرهاد عەزیز خۆشناو
- پێداچوونەوەو سەرپەرشتی: زنار تەها
- زنجیرەی مێژووی جیهان
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: موراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: ١٨٢٥
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣٨١)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com



## پێشکەشە بە:

## دایکی خۆشەویستم

## (وەرگێڕی کوردی)

## ناوەڕۆک

## پێشەکی وەرگێر

بێگومان لێکۆڵینەوە لە مێژوو بەرلەوەی پیشاندانی رووداوە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و مرۆیی و راستییەکانی هەرێمێکی جوگرافیایی و ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراوبێت، زانست و تەنانەت هونەرێکی سەربەخۆشە. ئەم کتێبە بەخێرایی و بە کورتی باسی مێژووی کۆنی ئێران و دروستبوونی ئیمپراتۆرییەتە هەوەڵییەکانی ئەو هەرێمە جوگرافیاییەی کردووە، کە مەڵبەندی ژیان و شوێنی درووستبوونی کولتوور و ژیاری کۆمەڵە نەتەوەیەکە کە لە مێژوودا بە ئاریایی ناسراون. وەك دیارە کوردیش لە رێزی یەکێك لەم نەتەوانەیە.

لەم کتێبەدا کە بە پێنووسی نووسەرێکی رۆژئاوایی نووسراوە، لەناو هیچ کام لە لاپەڕەکانی ناوی کورد نەهاتووە. بەڵام ناوەڕۆکی بابەتەکان هەڵگری پەیامێکی دوورو قووڵن سەبارەت بە مێژووی داپۆشراوی گەلەکەمان. ئەگەر بەوردی سەیری بابەتەکان بکەین، بەئاشکرایی شوێن پەنجەی کورد لە درووستبوونی مێژووی کۆنی ئێران بەدیاردەکەوێ.

هیوادارم بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە توانیبێتم خزمەتێکم کردبێ بۆ دووبارە ناسینەوەی مێژووی کۆنی نیشتمانێك، کە ناوەکەی بە ئەنقەست لەسەر زۆربەی نەخش و نیگار و شوێنەوارە دێرینەکان سڕاوەتەوە.

فەرهاد عزیز

شەقڵاوە ۲۰۰۸/۷/۱۵



## رووداوە گرنگەکانی مێژووی ئیمپراتۆرییەتی ئێران

**رووداوەکانی پێش زایین:**

**لە دەوروبەریساڵی ۲۰۰۰-۳۱۰۰**

کولتووری سۆمەری بەسەر دۆڵەکانی رووباری ناوچەی میزۆپۆتامیادا زاڵ بوو.

**دەوروبەری ۱۰۰۰-۱۱۰۰**

خیوەتنشینەکانی ئاریایی نەژادی ئاسیای ناوەندی، باب و باپیرانی ماد و پارسەکان بەرەو ئێران هاتن.

**دەوروبەری ۸۸۵**

ئاشوورییەکان بەخێرایی بەسەر زۆربەی خاکی میزۆپۆتامیادا سەرکەوتن.

**ساڵی ٦٢٥**

کیاکسار (هوەخشترە)ی دووەم بووە پاشای ماد، سوپای سەربازی بەهێزترکرد و دووبارە رێکی خستەوە.

**ساڵی ٦١٢**

هێزێکی یەکگرتووی مادەکان و بابلییەکان، نەینەوای پایتەختی ئاشوور تالان دەکەن و ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور لەناودەچێت.

**دەوروبەری ٥٩٩**

لەدایکبوونی کورووشی دووەمی پارسی کە دواتر بە ((کورووشی گەورە)) بەناوبانگ بوو.

### ساڵی ٥٥٨

کورووش دەبێتە پاشای پارس.

### ساڵی ٥٥٠

کورووش پاش سێ ساڵ جەنگ (ئیکباتان)ی پایتەختی ماد داگیردەکات و ئیمپراتۆرییەتی ماد لەناودەبات.

### ساڵی ٥٤٦

کورووش هێرش دەباتە سەر لیدیا، شاری سارد، کە پایتەختی ئەم وڵاتەیە داگیر دەکرێ. لەم رۆژگارە بەولاوە یۆنانییەکانی دانیشتووی شارەکانی ئیوونییە ملکەچی کورووش دەبن. ئەمە یەکەمین رووداوی گرنگی پەیوەندی نێوان یۆنان و ئێرانە.

### ساڵی ٥٣٩

وڵاتی بابل لەلایەن سوپاکانی کورووشەوە داگیر دەکرێت و ئیمپراتۆرییەتی بابل و سەرزەمینەکەی دەکەوێتە بەردەستی ئێرانییەکان.

### ساڵی ٥٢٥

کەمبووجیەی دووەم، جێنشین و کوڕی کورووش میسری داگیرکرد.

### ساڵی ٥٢٢

لە مانگی (رەشەمێ) مارس، کەسێکی فریووکار رایگەیاند، کە بەردیای کوڕی بچووکی کورووشە. کەمبووجیە پێشتر بەردیای کوشتبوو. ئەم فریووکارە لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێت. کەمبووجیە بەخێرایی بەشێوەیەکی گوماناوی دەکوژرێ. لە مانگی سێتامبەر (خەرمانان) چەند ئەفسەرێکی پایەبەرزی ئێرانی ئەم فریووکارە دەکوژن و داریووشی یەکەم دەبێتە ئیمپراتۆر.



### ساڵی ٥١٢

داریووش لە ئاودڕگەی بۆسفێر تێدەپەڕێت و دەچێتە ئەورووپا.

### ساڵی ٤٩٩-٤٩٨

بە پاڵپشتی هێزی بچووکی دەریایی شارە سەرەکییەکانی یۆنان واتا ئاتین و ئێرێتریا Eretria، شارە بچووکەکانی ئیوونییە یاخی دەبنەوە.

### ساڵی ٤٩٠

سوپای ئێران بە تێپەڕین لە دەریای ئیژە ئێریتریایان داگیرکرد و دانیشتوانەکەیان بەرەو شوێنی تر راگواست. چەند هەفتە دواتر ئێرانییەکان لەبەرامبەر هێزە بچووکە ئاتینییەکان و سەربازانی پیادەی چەك گەورە لە دەشتی ماراتۆنی باکووری رۆژهەڵاتی ئاتین شکستیان خوارد.

### ساڵی ٤٨٦

داریووش دەمرێ و کوڕەکەی بە ناوی خەشایار لە شوێنی دادەنیشێ.

### ساڵی ٤٨٠

خەشایار شا پردێك لەسەر ئاودڕگەی هێلسپۆنت (داردانێل) دروست دەکات و بە سوپایەکی گەورە هەڵدەکوتێتە سەر وڵاتی یۆنان. لە کۆتاییدا هێزە دەریاییەکانی یۆنان و هاوپەیمانەکانی لە کەنداوی سالامیس، کە دەکەوێتە باشووری ئاتین هێزی دەریایی ئێران شکست پێدەدەن. خەشایار دەگەڕێتەوە شاری سارد و ئەرکی جەنگ دەخاتە ئەستۆی مەردۆنیەی سەرداری سوپای ئێران.

**ساڵی ٤٧٩**

سوپای مەردونیە لە نزیك پلاتێ لەلایەن هێزی هاوپەیمانی یۆنان تووشی شکست دێت. ئێرانییەکان بۆ ماوەیەکی کاتی دەسبەرداری هێرش بردن بۆ ئەورووپا دەبن.

**ساڵی ٤٦٥**

خەشایار بەدەستی چەند پیلانگێڕێك دەکوژرێ و ئەردەشێری یەکەم لە شوێنی باوکی دادەنیشێت.

**ساڵی ٤٢٤**

ئەردەشێر دوای ماوەیەکی زۆر دەستەڵاتداری بەشێوەیەکی ئاسایی دەمرێ. دوای ململانێیەکی زۆر داریووشی دووەم دەبێتە ئیمپراتۆر.

**ساڵی ٤٠٤**

داریووش دەمرێت و پاش جەنگێکی خوێناوی بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات، ئەردەشێری دووەم لە شوێنی باوکی دادەنیشێت.

**ساڵی ٤٠١**

کورووشی بچووك، برای شای نوێ یاخی دەبێتەوە. کورووش سەرۆکایەتی سوپایەکی گەورە بە تایبەتی هەزاران سەربازی بەکرێگیراوی یۆنانی بە ئەستۆوەیە و لە کۆناکسا لە نزیك بابل راوەستاوە. کورووش لەم ناوچەیەدا لە بەرانبەر پاشای نوێ شکست دەخوات و بەکرێگیراوانی یۆنانی لە پاشەکشێیەکی دڵتەزێن و خوێناوی لە ئاسیاوە بەرەو دەریای رەش دەڕۆن.

**ساڵی ٣٥٨**

ئەردەشێری سێیەم لە شوێنی ئەردەشێری دووەم دادەنیشێت.



**ساڵی ٣٣٨**

یەکێك لەراوێژکارانی ئیمپراتۆر بەناوی باگۆس پاشای کوشت و لە شوێن شای کوژراو شازادەی گەنج بەناوی ئارسێس دەکاتە ئیمپراتۆر. فیلیپی دووەم پاشای مەقدوونیە دەوڵەت- شارەکانی گەورەی یۆنان شکست دەدات و دەبێتە فەرمانڕەوای سەرتاسەری یۆنان.

**ساڵی ٣٣٦**

ئاسێس بە دەستی باگۆس دەکوژرێ. باگۆس کەسێکی نەناسراوی سەر بە هۆزی هەخامەنیش بەناوی داریووشی سێیەم دەکاتە فەرمانڕەوا. لە یۆناندا فیلیپ دەکوژرێ و کوڕەکەی بەناوی ئەسکەندەری سێیەم کە دواتر ((ئەسکەندەری گەورەی)) پێدەگووترێ لە شوێنی دادەنیشێت.

**ساڵی ٣٣٤**

ئەسکەندەر لە ئاودڕگەی داردانێل تێدەپەڕێت و هێرش دەکاتەسەر ئێران.

**ساڵی ٣٣١**

ئەسکەندەر دوای شکست دانی هەر دوو سوپاکەی ئێران و پاش ئازادکردنی میسر، لە نزیك رووباری دیجلە لە گاوگمێل Gaugmela داریووشی شکست دا. داریووش هەڵدێت و چەند مانگ دواتر بە دەستی یەکێك لە ئەفسەرەکانی خۆی دەکوژرێ.

**ساڵی ٣٢٣**

ئەسکەندەر دوای گرتنی سەرتاسەری ئێران، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو دەمرێ. سەردارە گەورەکانی بەخێرایی بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات لەگەڵ یەکتری دەکەونە جەنگ. لە ساڵی ٢٨٠ ئیمپراتۆرییەتی ئەسکەندەر دابەشی سەر سێ پارچە دەبێت. بەشە بەرفراوانەکەی ئیمپراتۆرییەتی ئێرانی کۆن بەر سنووری دەسەڵاتی سلووکیەکان دەکەوێت.

**ساڵی ٢٣٨**

هۆزە خێیوەتنشینەکانی پارت ئیمپراتۆرییەتی خۆیان بەرفراوانتر دەکەن و لە ساڵی ١٤١ پارتەکان بە شێوەیەکی گشتی دەستبەسەر سەرتاسەری سنووری ئیمپراتۆرییەتی سلووکیەکان و میزۆپۆتامیادا دەگرن.

**ڕووداوەکانی پاش زایین**

**ساڵی ٢٢٤**

دوایین پاشای پارت (ئەشکانی) لەناودەچێت و ئیمپراتۆرییەتی ساسانی دادەمەزرێ.

**ساڵی ٦٥١-٦٣٧**

ساسانییەکان بەدەستی عەرەبەکان تەفروتونا دەکرێن و ئایینی ئیسلام دێتە ئێران و بڵاودەبێتەوە.

**ساڵی ١٩٤١ (١٣٢٠ی کۆچی هەتاوی)**

محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی دەبێتە پاشای ئێران. ئەم پاشایە لە دەیەی ١٣٤٠ (١٩٦٠ی زایینی) پلانی نوێخوازی لە ئێران وەگەڕ دەخات. لە ساڵی ١٣٥٠ (١٩٧٠) دوو هەزارو پێنج سەدەمین ساڵوەگەڕی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنیشی لەسەر گۆڕی کورووشی گەورە جەژن و ڕێوڕەسمێکی شکۆدار بەرپادەکرێ.

**ساڵی ١٩٧٩ (١٣٥٧ی کۆچی هەتاوی)**

دوابەدوای هاتنەکایەی نائارامی کۆمەڵایەتی و ئایینی لەئێراندا، سیستەمی پاشایەتی ڕووخاو شوێنی خۆی دایە سیستەمی کۆماری ئیسلامی کە دژی ڕۆژئاوا بوو و بە سەرکردایەتی ئایەتوڵڵا خومەینی بەڕێوە چوو.

## پێشەکی:

### ئایا یۆنان وڵاتێکی باش و ئێران وڵاتێکی خراپ بوو؟

لە ساڵی ٣٨٠ی پێش زایین ئیسۆکراتێسی زانای یۆنانی گووتوویەتی: بۆ ئێمە کە بیر لە ژیانی تایبەتی خۆمان دەکەینەوە، بەربەرەکان وەکوو کۆیلە وانە و تەنیا بۆ کۆیلەیی و کاری ناو ماڵی ئێمە دروستکراون، جێگەی شەرمەزارییە بۆ ئێمە، کە تاکوو ئەو ڕادەیە ڕێگە بە سیاسەتی گشتی خۆمان بدەین، هاوپەیمانانمان لەلایەن ئەوانەوە بەدیل و کۆیلەیی بگیرێن[1]. لە ڕۆژگارە کۆنەکان لە لایەن یۆنانییەکانەوە، گشت نەتەوەکانی تر بە بەربەر دەزانن. بەڵام مەبەستی سەرەکی و تایبەتی ئیسۆکراتێس لێرەدا ئێرانییەکان دەگرێتەوە، کە ئەوکات گەورەترین ئیمپراتۆرییان دامەزراند. ئیمپراتۆریەتێك کە لە ڕۆژئاوا تاکوو ئاسیای بچووك (تورکیای ئێستا)و لە ڕۆژهەڵات تاکوو سنوورەکانی هیندوستانی دەگرتەوە. ئەم چەند دێرە بەشێك لە وتارەکانی زانای یۆنانییە، کە پێشکەش بە دەوڵەت- شارەکانی یۆنانی کراوە. ئەو دەوڵەت- شارانەی کە بەردەوام پێکەوە دەجەنگان. مەبەستی ئیسۆکراتێس ئەوە بوو ئەم ویلایەتە سەربەخۆیانە ناکۆکیەکانیان بەولاوە بنێن و دژ بە ئێران یەك بگرن. ئیسۆکرات پێی وابوو، ئێرانییەکان ترسنۆك و ژنانینەو شایستەی جەنگ و جەنگاوەری نین. بەم چەشنە یۆنانییەکان بۆ سەرکەوتن و زاڵبوون بەسەر ئەم ئێرانیانەدا تووشی کێشەیەکی ئەوتۆ نابن.

ئیسۆکراتێس بە تەنیایی هەوڵی ئیهانەکردن و پووچ پیشاندانی ئێرانییەکانی نەدەدا. ئەرستۆ فەیلەسووفی ناوداری ئاتینیش ڕای وابوو بەربەرەکان، کە ئێرانییەکان دیارترینیان بوون ((بە شێوەیەکی سروشتی کۆیلە))نە. هەروەها لە کتێبی سیاسەتدا دەڵێت:

ناتوانین ئەوە ڕەت بکەینەوە، کە کۆمەڵە خەڵکانێك هەنە لەهەر شوێنێك بن کۆیلەنەو خەڵکانێکی تریش هەنە هەرگیز لە هیچ شوێنێك کۆیلە نینە. ئەمە لە بابەت بەگزادەو خانەدانانیش ڕاستە. بەگزادەو خانەدانانی ئێمە نە تەنیا لە وڵاتی خۆیاندا، بەڵکوو لە سەرانسەری جیهان خۆیان بە ڕەسەن و پاکنەژاد دادەنێن؛ کەچی کۆیلەکان تەنیا لە وڵاتی خۆیان دا پاکنەژاد و ڕەسەن زادەنە.



بەپشتبەستن بەم گریمانەیە ئەرستۆ ئەم ئەنجامەی دەستکەوتووە، کە فەرمانڕەوایی یۆنانییەکان بەسەر بەربەرەکان زۆر ئاساییە، کەچی بێگومان فرمانڕەواییکردنی بەربەرەکان بەسەر یۆنانییەکان دا نائاساییە. کاتێك، ئەم فەیلەسووفە بووە مامۆستای ئەسکەندەری شازادەی مەقدوونی- کە دواتر لە ساڵی ٣٤٢ی پێش زایین نازناوی ((گەورە))ی وەرگرت- دەمارگرژی دژە ئێرانیانەی خۆی ئاخنیە ناو بیروباوەڕیەوە. نزیکەی دە ساڵ دواتر، کە ئەسکەندەر ئێرانی داگیرکرد هێشتا پەروەردە فیکرییەکانی مامۆستاکەی خۆی لە بیرنەچوو بۆوە.

بەسووك و پەستدانانی دراوسێکانی سنووری ڕۆژهەڵات لەلایەن یۆنانییەکانەوە، بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەك ئەم دوو نەتەوەیەی گرفتاری بەدگومانی و دوژمنایەتی و جەنگ و خوێنڕشتنی درێژخایەن کرد. مێژووی پەیوەندی نادۆستانەی نێوان ئێران و یۆنان بۆ ساڵانی سەرەتای دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی ئێران بە دەستی کورووشی گەورە دەگەڕێتەوە. کورووش یەکەمین فەرمانڕەوای خانەدانی هەخامەنیشییە، کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شەشەمی پێش زایین ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنیشی دامەزراند. شارە یۆنانی نشینەکانی لێواری دەریای ئیژە لە ئاسیای بچووك، کە یۆنانییەکان ئیوونیەیان پێدەگووت لە لایەن کورووشەوە داگیرکران و لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین لەلایەن داریووش وخەشایار فەرمانڕەوایانی ئێران، هێرش کرا سەر هەرێمی خاکی یۆنان. یۆنانییەکان بەرپەچی ئەم هێرشانەیان داوە، بەڵام ڕق وکینەو دژایەتی و کوشت و کوشتار تاکوو سەدەیەك دواتریش لە نێوان ئێرانییەکان و یۆنانییەکان بەردەوام بوو. کەواتە سەیر نییە ئەگەر لە سەردەمی ژیانی ئیسۆکراتێس و ئەرستۆ بەلای زۆربەی هەرە زۆری یۆنانییەکان، ئێرانییەکان بە دوژمنی خوێنی و دێرین دابنرێن و بیرۆکەی دژایەتی کردن و جەنگ کردن دژ بە ئێران بۆ یۆنانییەکان سەرەنجڕاکێش بوو بێ.

### پەیوەندی پێکەوەبەستراوی یۆنانییەکان و ئێرانییەکان

مێژوو و چارەنووسی یۆنانییەکان و ئێرانییەکان لە ماوەی دوو سەدە بەتەواوی تێك هەڵکێشراوە و پێکەوە لکاوە، جا بۆیە مێژوونووسانی ئەم ڕۆژگارە و قوتابیانی زانکۆ بێ لێکۆڵینەوە لە مێژوو و کولتووری نەتەوەکەی تر ناتوانن لە مێژوو و کولتووری ئەوی تریان بکۆڵنەوە. بەداخەوە ئەنجامەکانی ئەم سەربردە مێژووییە تاڕادەیەکی زۆر هەمیشە بەزیانی ئێرانییەکانەوە ڕاڤەو شرۆڤەکراوە. چونکە زۆربەی ئەو سەرچاوە مێژووییە دێرینانەی، کە لەبارەی ئێرانی ئەوسا دواون بە پەڕەمووچی یۆنانییەکان نووسراوە. یەکێك لەو سەرچاوە

باوەڕپێکراوانە ((کتێبی مێژووەکان)) نووسینی هیرۆدۆتی مێژوونووسی یۆنانی سەدەی پێنجەمی پێش زایینە، کە بە درێژی باسی جەنگەکانی نێوان ئێران و یۆنان تاکوو ڕۆژگاری ژیانی خۆی دەکات. چەند نووسەرێکی تری یۆنانی لە کتێبەکانیان دا کۆمەڵە زانیارییەکیان لە بابەت مێژوو و کولتوری ئێرانی بەدەستەوە داوە، لەوانە: گەزنەفۆن (سەدەی چوارەمی پێش زایین)، دیۆدۆرووس سیکوولووس (سەدەی یەکەمی پێش زایین) پلووتارك (سەدەی یەکەمی پاش زایین)و ئاریان (سەدەی دووەمی پاش زایین) ناودارترینەکانیانن.



**کورووشی گەورە کە لە ساڵی ٥٥٠ تاکوو ٥٣٠ ی پێش زایین ئیمپراتۆری ئێران بوو، نازناوی "پاشای ماد و پارسەکان"ی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. نەتەنیا بە هۆی سەرکەوتنەکانی، بەڵکو لەڕووی بۆماوەییەوەش ئەم نازناوەی بە شایەنی خۆی دەزانی. ئاستیاگی ئێمپراتۆری ماد باوکی دایکی کورووش واتا باپیری کورووش بووە.**



## ڕوانگەیەکی دەسکاریکراو

زۆربەی ئەو سەرچاوە ئێرانیییانەی لە بابەت مێژوو و کولتووری ئێرانی لەبەردەست دانە لە سەدەی بیستەمی زایینی دۆزراونەتەوە. ئەم سەرچاوانە بریتینە لە: نەخشە هەڵکەنراوەکان و نووسراوە بەردینەکانی سەر گڵکۆ یان تەپۆلکە و تابلۆ گڵییەکان کە بەزۆری گوزارشە فەرمی و ئیدارییەکان دەگرێتەوە. ئەم شوێنەوارانە جگە لە چەند نموونەیەکی دیار، زانیاریەکی ئەوتۆمان سەبارەت بە بابەتی وەکوو ڕەگەزناسی پاشاکان و خانەدانان و پلانە گرنگەکانی سەربازی و نەخشەی بینا گەورەکان بە دەستەوە نادات و بەشێوەیەکی سەرەکی و ناتەواو باسی ڕووداوەکانی مێژوویی یان دابونەریت و ڕێوڕەسم و بیروباوەڕ و ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئاسایی کراوە. کەوابێ دووبارە ژیاندنەوەی ئێرانی کۆن بەلایەنی کەم تاکوو سەرەتاکانی دەیەی ١٩٠٠ی زایینی بە شێوەیەکی تایبەت لە ڕوانگە و دیدی یۆنانییەکانەوە بووە. زانای مەزنی ئێراننناس **ئا.ت. ئۆمستێد** دەڵێت:

> *زۆربەی ئەو سەرچاوانەی لە بابەت مێژووی هەخامەنیشی لەبەردەست دابوون بە زمانی یۆنانی بوون... ئەنجامی ئەمەش بە شێوەیەکی سروشتی ئەوەبوو، کە مێژووی ئیمپراتۆرییەتی بەهێزی هەخامەنیشی [بە گوێرەی زۆربەی دەقە مێژووییەکانی ڕۆژئاوا] بە شێوەی زنجیرە ڕووداوێکی ناپەیوەست پیشان دەدرا و تەنیا کاتێك سیمایەکی یەکگرتوو و واتاداری وەردەگرت، کە لەسەر شێوەی چیرۆکی دەوڵەتە بچووکەکانی یۆنانیدا پێشکەش کرابا*[٣].

ئەم ناسین و گوزارشە ناتەواوانەی کە لە بابەت کولتووری ئێرانی پێشکەش کرابوون، تێکەڵ بە دەمارگرژی و هەڵوێستە توندەکانی دژە ئێرانی سەرچاوە یۆنانینەکان بووبوون؛ ئەمەش ڕوانگەیەکی دوو لایەن و دەسکاریکراوی لە بابەت ئێرانییەکانەوە لێدەکەوتەوە. ئەدەبیات و هونەری ڕۆژئاوایی لە زۆربەی بوارەکان هەوڵی داوە ئەو چوارچێوە سەپێنراوانەی کە لەلایەن کەسانێکی وەکوو هیرۆدۆت و ئیسۆکراتێس داهێنراون بۆ هەتاهەتایە بهێڵێتەوە. لە زۆربەی ڕۆمان و فیلم و تەنانەت نووسراوە مێژووییەکانی ئەم ڕۆژگارە ئێرانییەکان وەکوو ((کارەکتەرو کەسێتی نێگەتیڤی ناو چیرۆك)) پیشان دراون و ئێرانیان وەکوو وڵاتێکی ستەمکار و دیکتاتۆر بە وێناکێشاوە. ئەو وڵاتەی کە هەرگیز شایستەو شیاو نەبووە، بەڵام بە دیکتاتۆریەتی خۆی هەوڵی داوە سەربەستی یۆنانینەکان پێشێل بکات و لێیان بستێنێتەوە. ئەم بۆچوونە ناتەواوانە تاکو ئێستا تەنیا شێوەی نەژادپەرستی کۆن و هەڵسەنگاندنە نەشیاوە نەتەوەخوازانەکانی بەهێزکردووە. ئەمە دیاردەیەکە، کە تاکو ئێستاش هەر بەرچاودەکەوێت: ئەو دەمارگرژییانەی

که کولتوورەکانی ڕۆژئاوایی بە کولتورو فەرهەنگێکی گەوهەردار و ڕەسەن و بە توانا دادەنێت و لە بەرامبەر کولتورەکانی ڕۆژهەڵاتی بە کولتور و فەرهەنگی ناپاك و بێ گەوهەر دادەنێت.

کاتێك کە ئەم دەمارگرژییانە کەمبوونەوە و وردەوردە گومانیان تێکرا، وێنەیەکی شیاوتر و ڕازاوەو ئەرێیانە لە هەیکەلی ئێرانی کۆن بەدیار کەوت. ئەگەر چی هەندێ لە فرمانڕەوایانی ئێران بەڕاستی بێ تواناو نەشیاو بوون، لە بەرامبەر کەسانێکی وەکوو کورووشی گەورەو داریووشی یەکەم، فرمانڕەوایانێکی گەورە و بەتوانا و بیرمەندو داهێنەر بوونە، کە دادپەروەری و کردارە مرۆڤانەییەکانیان لە جێگەی دەسەڵاتی ڕەهاو دیکتاتۆرانە لەسەر کورسی دەسەڵات دانا. ئیمپراتۆرییەتە مەزنەکەی ئەم فرمانڕەوایانە نە تەنیا لە ڕووی سەرچاوە سروشتی و کەلوپەلە مادییەکان، بەڵکوو لە ڕووی شێوازە جیاجیاکانی کولتووری کە بە شێوەیەکی ڕەسەن داهێنراوی خۆیان بوو، وەکوو دەوڵەتی یۆنان تەواو دەوڵەمەندو پڕ بەرهەم بوو. بە پێچەوانەی فرمانڕەوایانی یۆنانی، کە تەنیا بەسەر یۆنانییەکاندا سەروەریان دەکرد و بەسەر نەتەوەیەکدا فرمانڕەواییان دەکرد کە خاوەن زمان و میراتێکی کولتووری هاوبەش بوون. پاشاکانی ئێرانی کۆن پشتیان بە وەفاداری خەڵکەوە دەبەستا و چارەنووسی کۆمەڵە نەتەوەو گەلێکی جیاوازیان بەدەستەوە بوو، کۆمەڵە نەتەوەیەك کە هەرکامیان خاوەن میراتێکی نەتەوەیی، زمان، داب و نەریت و بیروباوەڕی ئایینی تایبەت بە خۆیان بوون. لەم ڕووەوە، کە ئێران لە کۆمەڵە نەتەوەو گەل و هۆز و خزمەتکارانی بیانی پێکدەهات و گشتیان بۆ گەیشتن بە ئامانجێك تێدەکۆشان، بیروباوەڕی بیانی و نوێ لە ئێراندا زیاتر بایەخی پێدەدرا تاکوو لە یۆنان. لەم ڕوانگەوە ئێران لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای ئەم سەردەمە دەچوو، کە هێز و تواناو دەسەڵاتەکەی تاڕادەیەکی زۆر لە ڕەنگاڵەیی کولتوورو فەرهەنگەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت.

سیمای ڕاستەقینەی ئێرانی کۆن لە ماوەی ئەم ساڵانەی دوایی وێناکێشراوە تاڕادەیەکی زۆر بۆ ئەو لێکۆڵینە بێلایەنانە دەگەڕێتەوە، کە بەم دواییانە لەسەر دەقە کۆنەکانی یۆنانی کراوە و تاڕدەیەکی زۆریش بۆ دۆزینەوە نوێکانی شوێنەوارناسان دەگەڕێتەوە. یەکەمین لێکۆڵینەوە زانستییەکان لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٣٠ی زایینی لەسەر شوێنەوارەکانی کۆشکی گەورەی ئێران لە تەختی جەمشید (بە زمانی یۆنانییەکان "پێرسپۆلیس" کە لە ٣٢٠ی پێش زایین بە دەستی ئەسکەندەر وێران و خاپوور کرا) ئەنجام دراو لە ساڵانی دواتر لەوێ و لە ناوچەکانی دیکەی ئێران کەلوپەل و تابلۆی گڵین دۆزرانەوە. **ئۆمستێد** لە بابەت ئەم شوێنەوارە دۆزراوانەوە دەڵێت:



*لە ڕێگەی ئەم شوێنەوارانەوە دەتوانین پەی بە ناوی ئەو کرێکارانە ببەین [کە ئەم کۆشکانەیان درووستکردووە] و ئەو وڵاتانەی کە ئەم کرێکارانە لەوێوە هاتوونە و ئەو کارانەی کە کردوویانە و بڕی ئەو موچەی کە وەریا نگرتووە. هەورەها ناوی کچی تازە لەدایکبووی داریووش و ئەو دیاریانەی کە لەم ناوەدا داریووش پێشکەشی کردوون، بۆمان ئاشکرانە... بە پێی ئەو دۆزینەوە شوێنەواریانەو ئەو تابلۆ و نووسراوە هەڵکەنراوانەی کە دۆزراونەتەوە، بۆ یەکەمجار دەتوانین سەبارەت بە ژیانی گشتی خەڵکییەوە بیرو بۆچوونێکمان لا درووست بێ[٤].*

بێگومان هەڵکۆڵین و توێژینەوەکانی سەدەی بیست و یەکەم زانیاریەکی زۆرترمان لە بابەت، ئێرانی کۆن واتا یەکێك لە بەهێزترین و شکۆدارترین ئیمپراتۆرییەکانی مێژووی جیهان، بەدەستەوە دەدات. بەڵام شکۆو گەورەیی و دەسەڵاتی بێوێنەی ئەم ئیمپراتۆرییەتە زیاتر لە سێ سەدەی نەخایاند. بۆ نموونە ئەگەر تەمەنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما کە دەسەڵات و گەورەیەکەی پتر لە حەوت سەد ساڵ بوو بەراورد بکرێ، ماوەیەکی زۆر نییە. بەڵام دەبێ سەرەنجی ئەوە بدەین، کە تەمەنی ئیمپراتۆرییەتی ئێران تاڕادەیەك یەکسانە لەگەڵ تەمەنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لە ساڵی ١٧٧٦ (١١٥٥ی کۆچی هەتاوی) دامەزرا. ئەمریکییەکان بەزۆری بە لەخۆباییانەوە سەیری مێژووی ئالۆزو سەرسامهێنەری خۆیان دەکەن، کە بووە هۆی دەستەبەرکردنی بەرهەمی کولتووری و سەربازی و هونەری نەمرو بێوێنە لە جیهانی ئەمڕۆیان دا. ئێرانییەکانیش مافی خۆیانە کە بە لەخۆباییانەوە سەیری مێژووی خۆیان بکەن.

(١)

## ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دێرین: چوار ڕێیانی کولتوورەکان

سنووری ئیمپراتۆرییەتی ئێرانی کۆن لەوپەڕی بەهێزی و شکۆداری خۆیدا، زۆرترین ئەو هەرێمە سنوورییە بووە، کە ئێستا ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پێدەگووترێ و لە ڕۆژئاوا کەنارەکانی دەریای مەدیتەرانەو لە ڕۆژهەڵات تاکوو سنوورەکانی هیندستانی دەگرتەوە. لەم ناوەدا نیشتمانی سەرەکی ئێران تایبەتمەندییەکی زۆرتری هەبوو و ئەو هەرێمە سنوورییەی دەگرتەوە، کە ئێستا خەڵکی ئێران و ئێرانییەکان تێیدا نیشتەجێ نە. بەشی ناوەڕاستی ئەم هەرێمە لەڕووی جوگرافییەوە سیمایەکی ڕەنگاڵەی هەیە، بانی بەرفراوانی ئێرانە کە نزیکەی هەزار تاکوو دوو هەزار مەتر لە ئاستی دەریا بەرزترە و ڕووبەرەکەی لە باکوور لە دەریای خەزەر (یان قەزوین)ەوە تاکوو کەنداوی فارس لە باشوور، نزیکەی هەزار کیلۆمەترە. لە گۆشەی ڕۆژهەڵاتی ئەم ناوچەیە دوو بیابانی پڕ خوێیی گەورە بەناوی دەشتی کەویرو دەشتی لووت هەڵکەوتوونە. لە ڕۆژئاوا زنجیرە چیا بەرزو ناهەموارەکانی زاگرۆس بە شێوەیەکی خوارو پێچ بە درێژایی بان لە باکووری ڕۆژئاواوە تاکوو باشووری ڕۆژئاوا راکشاوە. لە ڕۆژئاوای ئەم چیایانە کە لوتکەکانی هەمیشە پڕ لە بەفرن، بان بە خێرایی بەرەو دەشتە هەموارو زەنەکەکانی دۆڵی ڕووبارەکانی دیجلە و فورات نزم دەبێتەوە و ئەمەش ناوچەیەکە کە لە دێرزەمانەوە میزۆپۆتامیا (نێوان دوو ڕووبار)ی پێگووتراوە[٥].

ماوەیەکی زۆر بەر لە دروستبوونی ئیمپراتۆرییەتی ئێران، جۆراوجۆری سیمای جوگرافیایی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەڵکەوتە ستراتیژیکەکەی، ئەم نیشتمانەی بۆ ژیان و نیشتەجێ بوون سەرەنجراکێش کردبوو. ناوچەیەك کە بەشێوەیەکی سروشتی ببووە چواررێیانی کولتوورەکان. لە هەزارەی چوارەمی پێش زایینەوەو لەوانەیە زووتریش ئەم ناوچەیە مەڵبەندێك بووە بۆ حەواندنەوەی کۆچڕەوە بەردەوامەکانی گەلانی کۆچەر، بەتایبەتی ئەو گەل و هۆزانەی کە لە ئیستێپەکانی دەورو پشتی دەریای خەزەر لە باکوورەوە دەهاتن. ئەم پۆلە کۆچەرانە هەم



کاریان کردە سەر ڕەنگاڵەیی نەتەوەیی و کولتووری ناوچەکە و هەمیش کەڵکیان لە خۆشی و ئاسوودەیی و پڕ بەرهەمی ئەم سنوورە وەرگرت. هەوەڵێن یەکە سیاسییەکان کە دامەزران، دەوڵەت شارە سەربەخۆکان بوون، کە هەرکامیان لە ناوەندێکی شارنشینی پێکدەهات و لە دەورووپشتی ئەم ناوەندەش دێهات و کێڵگەی زۆر بەدی دەهاتن. لە ئەنجام دا چەند دەستەیەك لەم دەوڵەتە بچووکانە لەناو قاڵبی نەتەوەیەکی یەکگرتوو توانەوە، هەندێکیان سیمایەکی هێرشبەریان وەرگرت و بە دامەزراندنی سوپاو لەشکری گەورە دەستیان بەسەر نیشتمانەکانی دراوسێی خۆیان داگرت و یەکەمین ئیمپراتۆرییەتەکانیان دامەزراند. ئەم کارە بووە نموونەیەك بۆ گەشەی فراوانبوونی سەربازی و سیاسی. لوتکەی ئەم گەشە و پێشکەوتنە دامەزراندنی بەرفراوانترین ئیمپراتۆرییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە مێژوودا واتا ئیمپراتۆریەتی ئێران بوو.



**پاشماوەی شوێنەوارەکانی شارێکی کۆنی عیلامی. لەناو ئەو کەلوپەلە دەسکردانەی کە لە پاشماوەکانی شوێنەواری شارەکانی عیلامی دۆزراونەتەوە، کۆمەڵە کەلوپەلێکی جوانی گڵی بەرچاو دەکەون، کە شوێنەوارناسەکان "کەلوپەلی کەفتەری" یان پێگووتوە. ئەم کەلوپەلانە بەزۆری زەرد و بریسکەدارن و بە ڕیزی باڵندەی هەڵفڕیوو رازێنراونەتەوە.**

## ژمارەیەک لە نەتەوە بەختیارەکان

ئێرانییەکان وەکو زۆربەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێکی گرنگی هزرە سیاسی و سەربازی و کولتوورییەکانی خۆیانیان لەو ژیارو شارستانییەتە پێشکەوتووانە هەڵێنجاوە، کە لە کەنارەکانی ڕووباری دیجلەو فورات پێکهاتبوون. میزۆپۆتامیا بەهۆی فراوانی ئاو و خاکی بەپیت، یەکێك لە یەکەمین ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بوو (کە میسر دووەمینەکەیانە) لەرێگەی گەشەی کشتوکاڵی و ڕێگای بازرگانی و دەوڵەت- شارەکان. لە دەورووبەری ساڵانی ٣١٠٠ تاکوو ٢٠٠٠ی پێش زایین ئەم ناوچەیە لە ژێر دەسەڵاتی خانەدانانی پاشایەتی و دەوڵەت- شار و ئیمپراتۆرییەتە بچووکەکان بوو، کە بەهۆی ناوی شارە سەرەکییەکەی کە ناوی سۆمەر بوو، شارستانیەتی سۆمەری پێدەگووترێ. سۆمەر دەکەوێتە نزیك کەنداوی فارس و باشووری ڕۆژهەڵاتی عێراقی ئێستا. بە تێپەڕبوونی کات سۆمەرییەکانیش لەناو گەلە ناوەدارەکانی تری وەکوو بابلیەکان توانەوە کە شاری بابل پایتەختەکەیان بوو و دەکەوتە لێواری ڕووباری فورات و ٥٠٠ کیلۆمەتری باکووری ڕۆژئاوای کەنداوی فارس. خانەدانەکانی فرمانڕەوایی بابلی کە یەك بەدوای یەك لە شوێن یەکتر دادەنیشتن تاکوو هەزار ساڵ دواتر بەسەر میزۆپۆتامیادا سەروەرییان دەکرد. **چێستێر ستار** Chester starr ی مێژوونووس بەم جۆرە باسی ژیانی ئەم گەلانە دەکات:

*ئەم وڵاتە بەهۆی ئاوەڕێکان و جادەکان بەسەر پارچە زەوی ڕێکوپێك دابەش دەکران، کە بە ئامێری هەندەسی و ئەندازەیی دیاری کرابوون. جووتیاران بە ئامووەرکانیان و تۆێژینەداریەکان و پێمەرە بەردییەکان زەویان دەکێلاو جۆیان دەچاند؛ شوان و سەگەکانیان پاسەوانیان لە ڕانە مەڕو بزنەکان دەکرد. ناوچەکانی تر لە کۆمەڵە باخێك پێکهاتبوون، کە بە دیواری گڵی پەرژین کرابوون. لەم باخانەدا داری بە بەروبووم پەروەردە دەکران و دارخورماکان سێبەریان دەکرد. کەرو بارەکان لە کوێرە ڕێگاکان و بەلەمەکانیش لەناو ڕێگە ئاوییەکاندا بەروبوومی کشتوکاڵییان بەرەو ناوەندەکانی ژیان واتا شارەکان دەگواستەوە. شارەکان... بە خەندەق و دیواری خشتی دەور درابوون... لە پێش دەروازەی شارەکان دەستەی سەربازەکان چاودێری هاتووچوونەکانیان دەکرد لە نێوان ڕیزەخانووەکان کۆڵانەو جادەی گەورە بۆ تێپەڕینی عارەبانە و کەژاوەکان درووستکرابوون؛ لە پشتەوەی ئەم جادانە کۆڵانەو خانووی بچووکی لەگەڵ درووستکراو کە سەربانەکانیان بانگێر کرابوون، دەبینران. بەزۆری جووتیاران لەم بەشەدا دەژیان، کە هەمسوو ڕۆژێ بەرەو کێڵگەکان دەڕۆیشتن (ئەگەر چی کۆمەڵێکی زۆریان لە دێهاتە لاوەکی و بچووکەکان دەژیان)... و ئاسنگران و گۆزەگەران و خەڵکانی خاوەن پیشەی تریش لەو کۆمەڵگایانە دەژیان*[٦].






سۆمەری و بابلیە بەختیارەکان دەورو کارایی خۆیان بەرەو ناوچەو هەرێمی گەلانی دراوسێش گواستەوە و لە ڕوانگەی کولتوورییەوە دانیشتوانی بانی ئێران لە ریزی پێشکەوتووترین دراوسێکان بوون. یەکەمین فەرهەنگ و کولتووری دەوڵەمەند و گرنگی ئێرانی، کولتووری عیلامی بوو کە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین بەدی هات. بەشێوەیەکی گشتی بەرزاییەکانی باشووری بان و ناوچەی فارس (پارس یان پەرسە)و ناوچە هەموارەکانی لێواری کەنداوی فارس سنووری عیلامی پێکدێناو شاری شووش گرنگترین و ناوەندی ئەم کلتوورو فەرهەنگە بوو. عیلامییەکان ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەسەڵاتی سۆمەریەکان دابوون. بەلاّم وردە وردە لەهەزارەی دووەم و بە لاوازبوونی سۆمەر، عیلام وەکوو دەوڵەتێکی سەربەخۆی لێهات. لوتکەی گەشەی کولتووری و سیاسی و شارستانییەتی عیلام لە نێوان ساڵانی ١٤٥٠ و ١١٢٥ی پێش زایین بوو. عیلامییەکان لەم سەردەمە کۆمەڵێك نووسراوە بەردینیان بە زمانی تایبەتی خۆیان نوسیووە و لە هونەری دەستی ژمارەیەکی زۆر بەرهەمی بەرزو بەنرخی زێرین و زیوین و مەفرەغیان لێ دەستکەوتووە بە شێوەیەکی گشتی لە ژیانیان دا ئاسوودەو پرخۆشی بوونە.

لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی **نەبووکاد نەسر** Nebuchadnezzar ی یەکەم، بابلییەکان لە دوایین ساتەکانی سەدەی دوازدەمی پێش زایین هەڵیان کوتایە سەر عیلام و لەم کات وساتەدا ڕۆژگاری گەشەو شکۆی عیلامی کۆتایی پێهات. لە چوار سەدەی دواتر باشوور و ڕۆژئاوای

ئێران نەتەنیا لەلایەن بابلییەکانەوە بەڵکوو لە لایەن فرمانڕەوایەتیە جیاجیاکانی بیانی دەستی بەسەردا گیراو لەم ناودا دەوڵەتی ئاشوور یەکێك لە بەهێزترین ئەو دەسەڵاتە بیانییانە بوو. ئاشوور کە لە ناوی شاری ئاشووری نزیك کەنارەکانی باکووری دیجلەو وەرگیراوە، لە زۆربەی ساڵانی هەزارەی دووەمی پێش زایین بەشێوەی دەوڵەتێکی بچووك لە میزۆپۆتامیا خۆی دەنواند. دوای لە سەدەی نۆیەمی پێش زایین ئاشوورییەکان بە سەرۆکایەتی فرمانڕەوا جەنگاوەرەکانیان لە پڕا لە سنووری نیشتمانە بچووکەکەیان دەرچوون و دەستیان بە داگیرکردنی نیشتمانی دراوسێکانیان کرد و ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەیان دامەزراند. ئەم ئیمپراتۆرییەتە کە بەرفراوانترین سنووری دەسەڵاتداری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئەوسا بوو، لە ڕۆژهەڵاتەوە بەشی هەرە زۆری بانی ئێران و لە ناوەند بابل و بەشەکەی تری میزۆپۆتامیا و لە ڕۆژئاوا سووریا و فەلەستین و چەند پارچەیەکی سنووری نیشتمانی میسری دەگرتەوە. ناوبانگی دەوڵەتی ئاشوور دەگەڕێتەوە بۆ سوپا سەربازییە گەورەو تۆقێنەرەکەی و ئەو هەڵوێستە توندو بێبەزەییانەی کە لە کاتی داگیرکردن و شێوەی فرمانڕەوایی کردن بەسەر وڵاتانی داگیرکراوا هەیبوو. بەپێی نووسینەکانی **د.ج.ڤایزمەن** D.J.Wiseman:

> *شێوازەکانی ئاشووریان زۆر توند و بێبەزەییانە بوو؛ دەیانوویست لەناو ئەو گەل و هۆزانەی کە ملکەچی فەرمانی خواوەندی ئەوان نەبوون ((ترس و تۆقان)) درووست بکەن. گشت ئەو کەسانەی، کە توانای ڕاکردنیان نەبوو دەکوژران، دێهاتەکانیان تاڵان دەکراو بەروبوومەکانیان دەسوتێنرا. وردە وردە ناوچە تازە داگیرکراوەکان وایان لێدەهات باجێکی بەرایی و دوایێش باجێکی ساڵانە بدەن، تاکو پابەندبوون و ملکەچبوونی خۆیان پیشان بدەن. بەم چەشنە دەستکەوتێکی زۆر وەردەگیرا، و بەزۆری جەخت لەسەر کەلوپەلی نایاب و چەك و کەلوپەلی جەنگ وەکوو ئەسپ و گیانلەبەرانی تر دەکرا. ئەم دەستکەوتانە سەرچاوەیەکی نایاب بوون و دەزگای ئابووریی ئاشوورییەکانی دەوڵەمەندتر دەکرد. دەسەڵاتدارانی هەرکام لەو ناوچانەی کە هێرشیان دەکرایە سەر مەجبوور بوون لەناو بەڵێننامەیەکی وەفاداری و ملکەچبوونی خۆیان بە سوێند خواردن ڕابگەینن و ئەگەر بچووکترین تاوانیان و لادانی هەبێ دەبێ خۆیان بەدەست تووڕەیی و نەفرینی خواوەندانی ئاشووری بسپێرن. لە ڕاستیدا ئەم بەڵێننامەیە بۆ هەر کارێکی کە دواتر لەلایەن ئاشوورییەکان بکرابا، گەرەنتییەکی جێبەجێکردنی مەزەبی و سیاسی بەدی دەهێناو دەبووە هۆکارێکی بەهێز بۆ ئەو حاکمەی کە دەسەڵاتی پێدەسپێردرا، تاکوو هەڵەیەك نەکات و جارەکی دیکە تووشی هەڵە نەبێت...*



*ئاشوورییەکان کاتێك ناوچەیەکیان داگیر دەکرد، لەوێدا کەسێکی خەڵکی ناوچەکەیان دەکردە دەسەڵاتدار و پێگەیەکی بچووکی ئاشووریشیان دادەمەزراند، تاکوو بارودۆخی ناوچەکە و هەرجۆرە چالاکییەکی گێرەشێوێنانە بۆ گۆڕینی دەسەڵات ڕابگەیەنێت. ئەم گوزارشە سیخۆڕییانە لە ڕێگەی چاپار یان هەواڵگەیێن ڕەوانە دەکرا و لە کاتی خۆی هۆشدارییان بە ئاشوورییەکان دەدا کە هەماهەنگ و هاوتەریب لەگەڵ بەکرێگیراوان و خزمەتکارانیان هەڵوێست بنوێنن*[٧]

**ئەو هەوڵانەی کە بۆ دیاریکردنی مێژووی کۆچکردنی ئێرانییەکان دراوە**

مێژوونووسان تاکوو ئێستا بەتەواوی مێژووی کۆچڕەوی ئاریاکانیان بۆ روون نەبۆتەوە، **جان کوورتیس** Jhan curtis لە چەند دێرێك کە لە کتێبی **ئێرانی کۆن** دا هەڵبژێردراوە، دەڵێت: بە چ شێوازێك دەتوانین هەندێ زانیاریمان دەستکەوێ لە ڕێگەی پاشماوەکانی ئەو سۆفالانەی کە دروستکراون. بەتایبەتی ئەو جۆرەی کە بە ((کەلوپەلە ڕەنگ خۆڵەمێشیە هەوەڵینەکانی نیشتمانی ڕۆژئاوا)) بەناوبانگن و لە کۆتاییەکانی هەزارەی دووەمی پێش زایین لە باکووری ڕۆژئاوای ئێران دروستکراون.

"هەندێجار وا دانراوە کە دۆزینەوەی ئەم کەلوپەلە سۆفالی و خۆڵەمێشیانە لە ڕۆژئاوای ئێران بە واتای سەرەتای هاتنی ئێرانییەکان، باب و باپیرانی... مادەکان و پارسەکان بۆ سەرزەمینەکانی ئێستامانە. یەکەمین جار لەلایەن پاشای ئاشوور **شەلمەنسەری سێیەم** (Shalmaneser III 858-824ی پێش زایین) کە هێرشی بردە سەر ڕۆژئاوای ئێران باسی ئەم ئێرانییە بەراییانە کراوە. بۆچوونی مێژوونووسان وایە؛ ئەم خەڵکەی کە بە زمانی هیندوئەورووپی دواون، خەڵکی ڕەسەنی ئێران نەبوونەو واپێدەچێت نیشتمانی سەرەکی ئەوانە ناوچەیەك لەو دەشتە بەرفراوانانە بووبێت، کە بە درێژایی ڕۆژهەلاتی ڕووباری دانووب تاکوو چیاکانی ئۆڕاڵی گرتبێتەوە...کەلوپەلە سۆفالیە خۆڵەمێشییەکانی رۆژئاوای ئێران دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی ئاسن و واپێدەچێت لە کەلوپەلە خۆڵەمێشیەکانی چەرخی کۆنتری مەفرەغەوە کە لە هەڵکۆڵینەکانی... نزیك گۆشەی باشووری ڕۆژهەلاتی دەریای خەزەر دۆزراونەتەوە، سەرچاوەیان گرتبێت. لە هەڵکۆڵینە شوێنەوارییەکانی ڕۆژئاوای ئێران کە کەلوپەلی خۆڵەمێشیان تێدا دۆزراوەتەوە، دابڕانێکی کتوپڕ لەگەڵ شێوە سۆفالگەرییە سەرەتاییە رەسەنەکە بەرچاو دەکەوێت، و ئەم راستیەش دەتوانێ پیشاندەری ئەوەبێت، ئەو خەڵکانەی کە ئەم سۆفالگەرییەیان بەکاربردووە لە ڕۆژهەلاتەوە بەرەو ڕۆژئاوای ئێران هاتبن... بەم پێیە پێدەچێت ئێرانییەکان لە نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین بەرەو ڕۆژئاوای ئێران تێکشابن. ئەم گریمانەیە سەرەنجڕاکێشە، بەڵام بابەتەکە زۆر ئالۆزە... هیچ جۆرە زانیارییەك لە بابەت ژمارەی ئەو خەڵکانەی کە لەم کۆچڕەوە بەژداربوونە و هەروەها لە چۆنیەتی گەشت یان سەفەرو پێکهاتەی کۆمەلایەتی ئەم خەڵکانە لەبەردەست دانییە. لەوانەیە هەرگیز کێشەی دیاریکردنی مێژووی تەواو و وردی گەیشتنی ئەمانە بۆ ڕۆژئاوا بە شێوەیەکی دڵنیابەخش چارەسەرنەکرێ. لەوانەیە ئەم کۆچڕەوە لە ماوەیەکی دوورو درێژو تەنانەت پێدەچێت لە ماوەی چەند سەدە بەردەوام بووبێت.





**ئەم نەخشە هەڵکەنراوی سەر بەرد لە کوشکی ئاشوور بانیپاڵەوە دۆزراوەتەوە، عارەبانەیەکی جەنگییە و چوار سەربازی تێدایە، سوارچاکێکی کەوانداری تیرهاوێژ لە پێشەوە دەڕوات و پاسەوانی لێدەکات. هەندێ لە عارەبانەکانی ئاشووری، کە بچووکترو سووکتربوون کاراییەکی زیاتریان هەبوو، چونکە دەکرا بەشە پێکهێنەرەکانی لە پاڵ یەك بێتەدەر و دەشێ لە شوێنی ناهەمواریش بەکاربهێنرێت**

## پەیدابوونی ماد

بەڵام بەرلەوەی فەرمانڕەوایانی ئاشووری دەسەلاتی توندو بێبەزەییانەی خۆیان لە بەشە بەرفراوانەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەرەو پێش ببەن، زەمینەکانی لەناوچوونیان لە بەرزاییەکانی بانی ئێران فەراهەم ببوو. کۆچڕەوە بەردەوامەکانی هۆزە خێوەتنشینەکانی پێدەشتەکانی ئاسیای ناوەند بەدرێژایی هەزارەی دووەم بەردەوام بووە و لەوانەیە لە ساڵانی نێوان ١١٠٠ و ١٠٠٠ی پێش زایین ئەو پۆلە کۆچڕەوانەی، کە خۆیان بە ئاریایی دادەنا بەرەو **بانی ئێران** ڕۆیشتن. ناوی ئێران کە دواتر بۆ ئەم نیشتمانە دانرا، لە وشەی ((**ئاریانام**)) بە واتای ((**نیشتمانی ئاریاکان**)) داتاشراوە. بە گوێرەی ساڵنامەکانی ئاشووری لە نیوەی سەدەی نۆیەمی پێش زایین، دوو هۆزی ئاریایی بە یەکجاری لە ئێران دا نیشتەجێ بوون: یەکێکیان ((**مادا**)) کە ((**مادەکانیان**)) پێدەڵێن و بەزۆری لە بەشی باکووری ڕۆژئاوای بان و لە دەورووبەری شاری ئێکباتان (هەمەدانی ئەمڕۆ) جێگربوون و ئەوی تریان ((**پارسوا**)) واتا پارسەکان کە نیشتمانی عیلامی کۆن واتا فارسیان داگیرکرد.



**جەنگاوەرەکانی ئاشووری بەشێوەیەکی بێبەزەییانە ئەو کەسانەیان لە سێدارە داوە، کە لەکاتی هێرشبردنە سەر فەڵەستین بەدیل گیراون**

لەم دوو هۆزە نوێیەی ئێران، مادەکان یەکەمین نەتەوە بوون، کە لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هێزو دەسەڵاتی سەربازی و سیاسیان وەدەست هێنا. پێدەچێت مادەکان لە ناوەڕاستی دەیەی ٧٠٠ی پێش زایین بەڕادەیەکی تەواو بەهێزبووبن تاکوو بە لایەنی کەم مەترسییەك بن بۆ ئاشوورییەکان. چونکە ساڵنامەکانی ئاشووری باسی دووجار هێرش بردنە سەر مادەکان دەکەن، کە یەکەمیان بە سەرکردایەتی فەرمانڕەوا **تیلگێت پیلسێری سێیەم** Tiglath pileser (لە ٧٤٤ تاکوو ٧٢٧ی پێش زایین فرمانڕەوابووە) و دووەمیان بە سەرکردایەتی **سارگۆن** Sargon (لە ٧٢١ تاکوو ٧٠٥ی پێش زایین) بووە. ئاشوورییەکان کۆمەڵە نەخشەهەڵکەنراوێکیان لەم ڕۆژگارە لەسەر بەرد هەڵکەندووە، کە تێیدا قەڵای مادەکان پیشاندراوە. قەڵای مادەکان تاوەر و شوێنی دیدەوانی زۆر پتەوی هەبووە، کە کۆمەڵە دەرزێکیان هەبووە و مادە خۆڕاگرەکان لەناو ئەم دەرزانەوە دەیانتوانی بە هاویشتنی جۆرە چەکێك بە رووی دوژمن بەرگری لە خۆیان بکەن. بەو جۆرەی کە **ئۆمستێد** وەسفی کردووە، مادەکان بە شێوە ڕەسەنە تایبەتەکەی خۆیان لەم نەخشە هەڵکەنراوانەدا پیشان دراون:



*قژێکی کورت کە بە سەربەندێکی سوور بەستراوەو ریشی لوول لوولی کورت، شێوەی ڕەسەنی پیاوێکی مادیە. هەروەها لەسەر زرەی سەربازی پەستەکێکی پێستی مەڕیان دەکردە بەر، کە هێشتاش بۆ ئەم تازەهاتووانە باشترین پشتیوانە بۆ زستانە ساردەکانی بان و چەکمەیەکی درێژیان لە پێ دابوو تاکوو بتوانن لەناو بەفرێکی زۆر بەرێدا بڕۆن. تەنیا چەکی مادەکان ڕم بوو و بە قەڵغانی لە حەسیر دروستکراوی لاکێشەیی بەرگریان لە خۆیان دەکرد*[٨].

مادەکان سوارچاکانی تیرهاوێژیشیان هەبوو. ئەم شێوە سەربازییەیان لە باب و باپیرانی خێوەتنشینی پێدەشتەکانی ئاسیای ناوەندی بۆ بە میرات مابۆوە[٩].

مادەکان نەترس بوون و لە هێرشی ئاشوورییەکان نەدەترسان جا لەبەر ئەوە گەشە و پێشکەوتنێکی زۆریان بەخۆوە بینی. ترۆپکی ئەم ڕەهەندە بەرەو پێش چووە. دانیشتنی **کیاکساری دووەم** CyaxresII (**هووەخشتەر**) لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی لە ساڵی ٦٢٥ی پێش زایین بوو، کە فەرمانڕەوایەکی چالاك و بەتوانا بوو. سەرەنجام کیاکساری دووەم بڕیاری دا ئاشوورییەکان لەناوببات و لە ئەنجامی ئەمەوە ئیمپراتۆرییەتی ماد دامەزرا. بێگومان هۆکاری سەرکەوتنی کیاکساری دووەم بەرنامەی گەشەپێدانی سەربازی و ڕێکخستنەوەی سوپا بوو، کە هەر دوابەدوای ئەوەی لە شوێنی **فروەرتیش** Phraortes ی باوکی دانیشت، جێبەجێ کرا. کیاکسار رمبازان، تیرهاوێژان و سوارچاکانی سوپای خۆی لەناو یەکەکانی سەربازی جیاجیادا ریزکرد کە هەرکامیان بۆ ئامادەبوون لە مەیدانی جەنگ دا مەشقیان پێدەکرا. هەروەها یەك جۆرە بەرگ و رەختی بۆ سەربازەکان دەستنیشان کرد، کە بریتی بوو لە تەن پۆشێکی جلدی باسك درێژ کە تاکوو سەر چۆکی سەرباز دەهات و دوو قایشی کەمەر کە بە قولێپێکی بازنەیی بە تەنپۆشەکەوە دەبەسترا. هەروەها شەلواری جلد و کەوشی قەیتانداری لووت هەڵگەڕاوەیان لە پێ دابوو. سەربازەکان کڵاوێکی لبادیان دەکردە سەر کە لە پشتەوە تاکوو سەر ملیان دەهات. تیرهاوێژان و هەروەها هەندێ لەو سەربازانەی کە هەم رم و هەم کەوانیان بەکاردەبرد زۆر ئاگایان لە کەوانەکانیان بوو و تیرەکانیان لەناو تیردانێکی جلدی دەکردو بەشان یان بە ناوقەدیانەوە هەڵیاندەواسی. ئەگەرچی زۆربەی سەربازانی سوپای کیاکسار سەر بە هۆزەکانی رەسەنی مادی بوون، بەڵام لە هۆزە بچووکترەکانی تری ئێرانیش کە لە ژێر فرمانی ماد دابوون یان پێویستیان بە پاڵپشتیکردنی دەوڵەتی ماد بوو، سەربازی وەردەگرت. لە سەرەتاکانی رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی کیاکسار هەندێجار پارسەکانی ویلایەتی فارسیش لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی ماد دابوون.

### *عارەبانە جەنگییەکانی ئاشوور*

*یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرکەوتنی هێزی سەربازیی تۆقێنەری ئاشووری، بەکاربردنی عارەبانەی جەنگی بوو کە لێرەدا باسی لێوەکراوە (لە کتێبی جەنگ لە جیهانی کۆن ی ئاشوور ناسی بەتوانا د.ج. ڤایزمەن وەرگیراوە.)*



**نموونەیەك لە عارەبانەکانی ئاشووری کە لەکاتی جەنگدا سێ جەنگاوەری تێدایە. ئەم عارەبانە دەیتوانی لە ماوەی ڕۆژێکدا پەنجا کیلۆمەتر ڕێگە ببڕێت، خێراترین و چابوکترین عارەبانەی ڕۆژگاری خۆی بوو.**

"هێزو توانای سەرەکی لەشکری ئاشوور بۆ عارەبانە جەنگییەکان دەگەڕاوە. ئەم ئامێرە جەنگییە لەماوەی سەدەکانی سێزدەم و دوازدەمی پێش زایین لە دەشتەکانی باشوور (**میزۆپۆتامیا**) بەکاردەبردراو دواتر بە بەکارهێنانی ئەسپی چالاکتر کە بۆ ئەم جۆرە عارەبانانە پەروەردە دەکران و هەروەها گۆڕینی شێوەی خودی عارەبانەکان، گەشەو پێشکەوتنێکی زۆری بەخۆیەوە بینی. عارەبانەکانی سەدەی نۆیەمی پێش زایین زۆرجار بە چوار ئەسپ ڕادەکێشران، بەڵام خێرانەبوونی ئەسپەکان بووە هۆکارێك تاکوو وەکوو عارەبانەی جەنگی کەڵکی لێوەرنەگیرێ. ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە پیشەی ئاسنگری بۆ دروستکردنی ئامێری گواستنەوەی خێراتر بەیارمەتی دار و تایە ئەنجام درا، ئەم جۆرە عارەبانانەیان باشتر و کارامەتر کرد. ئەو گۆڕانە ئەوەی لێکەوتەوە، کە ئەم جۆرە عارەبانانە خێراتر بڕۆن... عارەبانەچی لە پشت عارەبانەکەوە خۆی توند ڕادەگرت و جڵەوی ئەسپەکانیشی بەدەستەوە دەگرت و بەم جۆرە کۆنترۆڵکردنی لغاوی هەردوو ئەسپەکە ئاسانتر دەبوو. شێوەی عارەبانەکە سیمایەکی لاکێشەیی زۆرتری پێدرا تاکوو بەکاربردنی زرێ و ڕاوەستانی سەرباز ئاسانتر بێت... لە کاتی جەنگ ئەسپێکی یەدەك لە پشتەوەی دەبەسترا. بەزۆری عارەبانەی سووك دوو سەربازی تێدابوو، یەکێکیان عارەبانەچی و ئەوی تریان تیرهاوێژ یان ڕمهاوێژ بوو. بەڵام لە سەدەی نۆیەمی پاش زایینەوە کەسی سێیەم یان سەربازی سێیەمیش کە قەڵغانێك یان دوو قەڵغانی پێ بوو بۆ بەهێزکردن و پاراستنی پشتەوەی عارەبانە زیادکرا... ئەم عارەبانانەیان شڵەژان و شێواندنێکیان لە ناوەندی بەرەکانی جەنگ درووست دەکرد، ئەو تاکتیکە سەربازییەی کە کاریگەری هێرشکردنی سەربازانی پیادەی دوژمنی لەکاتی جەنگی کراوەدا کەم دەکردەوە، یان لە دوو باڵی بەرەی جەنگ لەکاتی گەمارۆدانی دوژمن لە تەك سەربازانی سوارچاك بەکاردەبردرا."



## ڕووخانی دەوڵەتی ئاشوور

کاتێك کیاکسار دڵنیابوو سوپاکەی بەتەواوی گەورەو بەهێز بووە، نەخشەی خۆی لە بابەت هێرشکردنە سەر ئاشوور جێبەجێ کرد. کیاکسار دەیزانی ئەو ئاشوورەی کە سەردەمێکە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەکوو گرێیەکی نەخۆشی وابوو، ئێستا بەهۆی گێرەشێوێنی و ڕاپەڕینە جیاجیاکانی هۆزو گەلانی ژێردەستی، لاواز و بێ هێز بووە. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ دوژمن بە کەم و نزم دابنرێت و بەم پێیە ژیرانە لەگەڵ **نابۆپۆلاسار** Nabopolassar ی پاشای بابل یەکیان گرت. لە دەورووبەری ساڵی ٦١٤ی پێش زایین هێزەکانی یەکگرتووی مادو بابل هەڵیان کوتایە سەر نیشتمانی سەرەکی ئاشوور کە دەکەوێتە کەنارەکانی سەرەوەی ڕووباری **دیجلە**. شارەکان یەك بەدوای یەك دەکەوتنە ژێر دەستی هێرشبەران تاکوو لە ئەنجامدا گەورەترین و گرنگترین شاری ئاشوور واتا نەینەوایان داگیرکرد. ناحووم پەیامبەری جوولەکە کە لە ڕۆژگاری کیاکسار دەژیا، بەم جۆرە وەسفی لەناوچوونی خوێناوی شارمان بۆ دەکا:

*"وێران کار [کیاکسار؟ نابۆپۆلاسار؟ دەستی خواوەند؟] ڕووبەڕووت دەبێتەوە. دیوارەکان بپارێزە، چاودێری ڕێگاکان بکە، پشتی خۆت توند بکە و هێزو تواناکەت زۆر بکە... قەڵغانی زەوارەکانیان سوور بۆتەوەو پیاوانی جەنگی جلی سووریان لەبەردایە و عارەبانەکانیان پۆڵایینە و ڕمەکان ئائارامن. عارەبانەکان لەناو کۆڵانەکاندا بەخێرایی لە هاموشۆدانە و لەسەری کۆڵانەکان ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. جووڵانەوەیان وەکوو مەشعەڵەکان وایە، وەکوو با هەڵدێن... جۆگەی ئاوەکان تەقیوون و کۆشك سوور بۆتەوە. حۆسەب ڕووتکراوەتەوەو (بە دیلی) گیراوە (شابانوو) و کوێرکەرەکانی دەستیان بە شین و گریان کردووە. و نەینەوا لەو ڕۆژەوەی کە بیناکراوە وەکوو گۆمێکی ئاو وابوو، بەڵام خەڵکەکانی هەڵدەهاتن (و ئەگەرچی هاوار دەکەن) بوەستن، بوەستن، کەس گوێی لێ نابێت. زیوەکان هەڵگرن و زێڕەکان بەتاڵانە بەرن، چونکە خەزێنەکان و کەلوپەلە گرانبەهاکانیان بێ کۆتاییە. چۆڵ و وێران و خاپوورە و جەرگی سووتاوە و ئەژنۆکانی دەلەرزن و پشتیان شکاوە و سیماکان بێ ڕەنگن... ئای لەو شارە خوێنڕێژە کە پڕ درۆ و کوشت وکوشتارە و تاڵان و پاتارکردن لێی دوور نابێتەوە. دەنگی قامچییەکان، خرەخرەی تایەی عارەبانەکان، دەرپەڕینی ئەسپەکان و هاتوچوونی عارەبانەکان دەبیسترێ و دەبینرێت. سوارچاکان هێرش دەکەن و شەمشێرەکان هەڵکێشراون و ڕووتن. زۆری ژمارەی بریندااران و کوژراوان و لاشەی کوژراوان بێکۆتایینە. بەسەر تەرمی یەکتردا دەکەون."*[1]



**کیاکساری دووەم (لەسەر پشتی ئەسپ) ماوەیەك پاش وەرگرتنی دەسەڵات، کۆمەڵانی خەڵکی وڵاتی خۆی بۆ بەرگریکردن لە وڵات یەکخست. بڕواننە کڵاوی لبادی کە تایبەت بە مادەکان بوو.**

هێرشکردنە سەر ئاشوور ئەوها سەرکەوتووانەبوو، کە ئەو ئیمپراتۆرییەتە بەهێزە بەخێرایی و بە یەکجاری لەناوچوو. لەمەو بەدواوە تەنیا بیرەوەرییەك کە لە ئاشوورەوە ماوە بێبەزەیی و درندەییەکەی بوو[11]. مادەکان و بابلییەکان نیشتمانی ئاشووریان بەسەر خۆیان دا دابەش کردو ماوەیەکی زۆر بە ئاشتی و کامەرانی پێکەوە ژیان. **نەبووکاد ناسری دووەم** Nebuchadressar II کوڕی **نابۆپۆلاسار** کە لە ساڵی **٦٠٥**ی پێش زایین لە شوێنی باوکی دانیشت، بەهۆی زەماوەندکردن لەگەڵ شازادە خانمێکی مادی بەناوی **ئامی تیس** Amytis ئەو یەکێتیە مەزنەی پتەوتر کرد. هەر لەبەر ئەم شازادە خانمە ئێرانییە بوو، کە ئەم پاشایە باخە هەڵواسراوەکانی بابلی بیناکرد. ئەو باخانەی کە دواتر لە ریزی حەوتەوانە سەمەرەکانی جیهانی کۆن بەژمارهات. لەناوچوونی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور جگە لەوەی کە مادەکان و بابلییەکانی لێکنزیك کردەوە، هاوسەنگییەکی نوێی دەسەڵاتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدی هێنا، کە



تێیدا چوار نەتەوە بە دەسەڵاتێکی یەکسان فەرمانڕەوایەتییان دەکرد. ئەم چوار دەسەڵاتە بریتی بوون لە مادو بابل و لیدی کە زۆربەی ئاسیای بچووکی لەدەست دابوو و میسر. (زۆرجار بابل بە **کالدە** Chaldea ناوی هێنراوە، چونکە نابۆپۆلاسار لە کالدە یان کەلدە کە ویلایەتێکی بچووك بوو لە کەناری باکووری کەنداوی فارس، فەرمانڕەواییەتی خانەدانی پاشایەتی کالدانی دامەزراند).

## تاریکایی لە ڕۆژدا

بەڵام کیاکسار لەم یەکسانبوونەی دەسەڵات ڕازی نەبوو. ئەویش وەکوو پاشاو سەرکردە سەربازییە سەرکەوتووەکانی مێژوو، ئاواتی گەشەپێدانی سنووری خۆی دژ بە دراوسێکانی هەبوو. کیاکسار ماوەیەك دوای بەهێزکردنی دەسەڵات لە ناوچەکانی ئاشووری کۆن، دەستی بە داگیرکردنی سنووری ناوچەکانی دەرەوە کرد. مادەکان دوای جەنگێکی دژوار لە هێڵەکانی کەناری و دارستانی باشووری دەریای مازەندەران **کادوسییەکانیان** خستە ژێردەسەڵاتی خۆیان. کیاکسار هێرشی کردە سەر ڕۆژئاواو لە ساڵی **٥٩٠**ی پێش زایین ئەرمینیای داگیرکرد، کە ناوچەیەکی شاخاوی نێوان ئاسیای بچووك و دەریای مازەندەران بوو.

کیاکسار لە لایەکی ترەوە بڕوای وابوو، کە ئەم هێرشانە ئەوانی بەهێزتر کردووە. بەڵام لە لایەکی ترەوەش بیری لە کێشە و مەترسییەکانی راگرتنی سنوورەکانی ئیمپراتۆرییەتێکی بەرفراوانی نەکردبۆوە. لەم بارەوە دەتوانین ئاماژە بە کێشەکانی پەیوەندی و گواستنەوە و گەیاندنی سەربازان و دابینکردنی پێداویستییەکان لەسەر ڕێگایان بکەین. زۆرترین مەترسی بۆ شۆڕشی گەلانی ناو ئیمپراتۆری دەگەڕاوە، لەبەر ئەوەی ئیمپراتۆرییەتی ماد لە کۆمەڵە دەوڵەتێکی دەست بەسەرداگیراو پێکدەهات، کە خاوەن نەژادو کولتووری جیابوون و گشتیان رقیان لە مادەکان دەبۆوە، چونکە بەزەبرو زۆری بەسەر ئەواندا فەرمانڕەواییەتیان دەکرد.



**وێنەیەکی باخە هەڵواسراوە ئەفسانەییەکانی بابل کە لەلایەن نەبووکەدنەسری دووەم بۆ دڵخۆشکردنی "ئامی تیس" ی هاوسەری کە شازادە خانمێکی مادی بوو، دروست کرا.**

راستییەکی ئاڵۆزتر ئەوەبوو، کە زمان و داب و نەریتی ناوچەیی مادەکان ئەوەندە بۆ گەلانی داگیرکراو سەرنجراکێش نەبوو، کە بە ساکاری پەسندی بکەن. **ئاڵێساندرۆ باووسانی** Alesandro bausani بەم جۆرە دەنووسێ:

*پێناچێ مادەکان خاوەن کولتوورێکی زۆر دەوڵەمەند بووبن، چونکە لەناو نووسراوە بەردینەکانی پاشاکانی پارسی، کە دوای یەکگرتنی دەوڵەتی مادو پارس نووسراون بە پێویستیان زانیوە زمانی عیلامی و بابلی بەکاربێنن نەك زمانی مادی و لەوانەیە شێوەی نووسینی نەبووبێ و جیاوازییەکی ئەوهای لەگەڵ زمانی فارسی نەبووە. هەروەها واپێدەچێت داب و نەریت و رێورەسمی پاشاکانی ماد لە رێورەسمی بابلی و ئاشوورییەوە سەرچاوەی گرتبێ*(١٢)



*باخە هەڵواسراوەکان، باخێکی سەرسوڕهێنەر*

*دیۆدۆرووس سیکوولووس* ***Diodorus Siculus*** *ی مێژوونووسی یۆنانی سەدەی یەکەمی پێش زایین لەم بەشەی کتێبەکەی بەناوی "کتێبخانەی مێژوو" باسی باخە هەڵواسراوەکانی بابل دەکات. ئەو باخانەی کە لە ریزی حەوتەوانە سەیرو سەمەرەکانی جیهانی کۆن دا بە ژمارەهاتووە.*

*((ئاکرۆپۆلیس (شوورەکانی ناوەندی شار) دەکەوێتە نزیك ئەو شوێنەی کە باخی هەڵواسراوی پێگووتراوە، کە لەلایەن پاشای (بابل) بۆ دڵخۆشی هاوسەرەکەی درووست کراوە؛ چونکە ئەم ژنە بەرەگەز پارسی بوو (لێرەدا دیۆدۆرووس بە هەڵە ناوی پارسی لەجیاتی ماد هێناوە) و ئارەزووی کێوە سەر سەوزەکانی نیشتمانی خۆی هەبوو، داوای لە پاشا کرد تاکوو باخێکی وەکوو باخە سەوزەکانی وڵاتی پارسی بۆ دروست بکات... باخەکە وەکوو بناری گردێك لێژبوو و بەشە جیاجیاکانی پۆل پۆل لەسەر یەکتر هەڵکەوتبوون، و دیمەنە گشتییەکەی وەکوو باخێکی هەڵواسراو وابوو. کاتێك کە سەکۆ پەیژەییەکان درووستکران، لە ژێرەوەیان کۆمەڵە هۆڵێك دروستکران و لەناوەوە و لە سەرەوەیان کۆمەڵە دارێك چاندرا کە وردە وردە لەسەر یەکتری گەشەیان کرد... بنمێچی ئەم هۆڵانە بەستوونی بەردین، کە بەرزییەکەیان دەگەیشتە ١٦ پێ، رادەگیرا... بانەکەی سەر ئەم ستوونە بەردییانە یەکەمجار بەرێزە قامیشێك کە قیرِ (قەتران)ێکی زۆری بەسەردا دەپرژا، دەپۆشراو لەسەر ئەم قامیشانە خشتی برژاو کە ئاهەکیان پێ داکرابوو، دادەنرا. دوای ئەمە کانزای سۆربیان لەسەر دادەناو دواتر خۆڵیان بەسەر دادەکرد تاکوو تەڕایی و شێداری دزەنەکات لای خوارەوە. لە خوارەوەش زەوی بەرادەیەکی زۆر هەڵدەکۆڵرا تاکوو دارە گەورەکان بتوانن ڕەگ و ڕیشە بدەنەوە. هەروەها زەوی... هەموو جۆرە دارێکی لەسەر چاندرابوو... و چونکە گشت هۆڵەکان... بەڕادەی پێویست رووناکیان پێدەگەیشت، کۆمەڵە شوێنێکی شکۆداری شاهانە بە یارمەتی وێنەی رەنگاوڕەنگ دروستکرا؛ و لەناو دیواری یەکێك لە هۆڵەکان دەرزێك دانرا و چەند ئامێرێکیان لەوێ دانا کە ئاوی پێویستی گشت باخی لە رووبار وەردەگرت و بۆ هەموو شوێنێکی دەبرد."*

کیاکسار دڵنیابوو دەتوانێت سنووری جوگرافیایی ئەو وڵاتانە بپارێزێت، کە دەستی بەسەر داگرتبوون. پێی خۆشبوو کۆمەڵە وڵاتێکی تریش بخاتە ناو چوارچێوەی سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەی. لە دەورووبەری ساڵی ٥٨٩ی پێش زایین لە ڕێگەی ئەرمینیاوە بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێکەوت و زلهێزێکی گەورەی تر، کە دەوڵەتی لیدیا بوو کەوتە بەر لێشاوی سەربازانی کیاکسار. زۆرتری سنووری خاکی تورکیای ئەمڕۆ سەربە هەرێمی دەسەڵاتی دەوڵەتی

لیدیا بوو. **ئالیّاتیّس** Alyattes پاشای لیدی بە سوپا بەهێزەکەی ڕووبەڕووی کیاکسار بۆوە. بە پێی نووسراوەکانی هیرۆدۆت "جەنگەکە پێنج ساڵی خایاند، کە تێیدا هەم لیدیاییەکان و هەم مادەکان چەندین جار سەرکەوتنیان بەدەست هێنا." بەڵام ئەو شتەی لەپڕاو بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو کۆتایی بە جەنگەکە هێنا هۆکارێکی مرۆیی نەبوو، بەڵکوو پێشهاتێکی سرووشتی بوو. یەکێك لە گەورەترین پێشهاتە سرووشتییەکانی مێژوو بڕیاری کۆتایی پێهێنانی ئەم جەنگەی دەرکرد. لە ڕۆژی ٢٨ی مەی (نزیکەی ٧ی گەلاوێژ) ی ساڵی ٥٨٥ی پێش زایین لە لوتکەی جەنگی نێوان دوو بەرەی دوژمن، خۆرگیرانێکی گەورە ڕوویدا. دواتر **هیرۆدۆت** بەم جۆرە لەم خۆرگیرانە دوواوە:

> **دوای پێنج ساڵ جەنگی بێ ئەنجام ڕێك لەوکاتەی کە هەردوو بەرەی جەنگی لە مەیدانی جەنگدا بوون، لە پڕا ڕۆژ وەکوو شەو تاریك داهات. پێشتر یۆنانییەکان ( کە لەوکات سەر بە لیدیا بوون و لەوانەیە هەندێکیان وەکوو سەرباز لەناو سوپای ئالیّاتیّس دا خزمەتیان دەکرد) ئەم تاریکبوونەی ڕۆژیان لە زمانی تالێسی میلێتس Thalesof miletus ەوە پێشگۆیی کردبوو و ئەو ئاماژەی بە بەرواری تەواو و وردی ئەو ڕۆژە کردبوو، کە ئەم ڕووداوی تێدا ڕوودەدات. هەم لیدیاییەکان و هەمیش مادەکان کاتێك کە ئەم تاریکبوونەی ڕۆژیان بینی دەستیان لە جەنگکردن کێشاوە**[١٣].

کیاکسار بڕوای وابوو ئەم تاریکبوونە لەپڕاییەو تۆقێنەرە لە ناوەڕاستی ڕۆژدا، پیشاندەری چارەنووسێکی بەد و نەشیاوە. جا بۆیە سوپاو هێزەکانی خۆی لە خاکی لیدیاوە کێشاوەو هەرگیز بەرەو لیدیا نەگەڕاوە. یەك ساڵ دواتر کۆچی دوایی کردو نەیزانی ئەم ڕۆژگیرانە پیشاندەری چارەڕەشی مادەکان بووە؛ چونکە ئیمپراتۆرییە تەمەن کورتەکەیان تووشی ڕۆژگیرانێکی گەورەتر هات. زۆری نەخایاند کە ئێمپراتۆرییەتی ماد بەدەستی یەکێك لەو هۆزانەی کە لەژێر فەرمانی ئێمپراتۆرییەتەکەیان دابوو، لەناوچوو. پارس ئەو هۆزە و نەتەوەیەی کە میراتی کولتووری و زمانیان زۆر لە مادەکان نزیك بوو، و لەناکاو ناوی مادی سڕیەوە. پارسەکان بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو و سەرسوڕهێنەر هەنگاویان نایە ناو قۆناغێکی گەورەی مێژوویی.

## (٢)

## کەسێکی زانا و بەتوانا
## کورووشی گەورە ئیمپراتۆری دادەمەزرێنێ

کاتێك کە **کورووشی** دووەم گەورەترین پاشاو دامەزرێنەری ئیمپراتۆرییەتی ئێران (**هەخامەنیشی**) لە دەوروبەری **٥٩٩**ی پێش زایین لە دایکبوو، جیهانەکەی هەر لەو ڕۆژگارەوە کۆن ببوو. بە درێژایی دەیان سەدەی پڕ کێشەو ئاڵۆز، ئیمپراتۆرییەتە گەورەکانی میزۆپۆتامیاو ئێران بەردەوام سەریان هەڵدابوو و لەناوچووبوون و کۆمەڵە شارێکی وێران و هەروەها ئاوات و ئامانجی دارماویان لە دوای خۆیان بەجێ هێشتبوو. مادەکان نوێترین شەپۆلی ئەم هەڵبەزین و دابەزینەی دەریای بەرفراوانی مێژوو بوون کە لە گشتیان بەهێزتر بوون. کاتێك سوپای سەربازانی کیاکسار سەرتاسەری ئەرمینیای کوتاوەو دوایی بۆ گرتنی لیدیا بەرەو ڕۆژئاوا هەڵکشا، کورووش تەنیا دە ساڵان بوو. لەوکات ئەم ڕۆڵە بچووکە نەیدەزانی شەپۆلی خێرایی دەسەڵاتی ماد لە پڕا لەناودەچێت، یان ئەو کەسەی کە سەرۆکایەتی ئەم لەناوبردنەی بە ئەستۆوە دەبێ، خودی ئەوە.

هەروەها کورووشی گەنج لە خەویشدا نەیدەدی ئەو و کوڕ و نەوەکانی دەتوانن گەورەترین ئیمپراتۆرییەتێك دابمەزرێنن کە تاکوو ئەو کات بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا فەرمانڕەواییان کردووە. ئەم کوڕە نەوەی هەخامەنیشە ئەو کەسەی کە دامەزرێنەری ئەفسانەیی خانەدانی پاشایەتی پارس بوو و هەروەها دەڵێن هۆزە کێونشینە بەراییەکانی فارسی وەکو نەتەوەیەکی بچووك بەدەوری یەکدا کۆکردەوە. ئەم گەلە لەخۆباییە ئێستاکە لە ژێر فەرمانی مادەکان دابوون. بەڵام چارەنووس وای دانەنابوو، کە ئەم بارودۆخە ماوەیەکی زۆر بخایێنێ. کورووش کە گەورەتر بوو پیاوێکی بیرمەندو لێهاتوو و ڕەشید و بە توانای لێکەوتەوە. گەورەترین ئاواتی تەنیا ڕزگارکردنی گەلەکەی لە چەنگ دەسەڵاتی مادەکان نەبوو، بەڵکوو توانی لە ماوەیەکی کەم دا خانەدانی هەخامەنیشی بگەیەنێتە دەسەڵات و هێزێکی مەزن و پارس لەسەر دەستی ئەو ناو و دەورێکی گەورەی لە زۆربەی جیهانی ناسراوی ئەوسا پێداکرد. **ئالێساندرۆ بائووسانی** دەنووسێ:

> *پەیابوونی لەناکاو و بەهێز بوونی پارسەکان بە سەرکردایەتی... کورووشی گەورە... یەکێك لە دیاردە سەرسوڕهێنەرەکانە و بێگومان ئەمەش پێشهاتێکی نەبینراوی مێژووی دێرین و ئێستای ئاسیا نییە. ئەو پیشان دەدات، کە دەوڵەتێکی بچووك دەتوانێ بێ هۆکارێکی دیار، وەکوو ئەستێرەیەکی نوێ لە پڕا بتروسکێتەوەو رووبەری نیشتمانی خۆی بەرەو گەل و نەتەوەو هۆزو نەژادە جیاجیاکان بەرفراوان بکات[١٤].*





وێنەی خەیاڵی کورووشی دووەم، یەکەمین و گەورەترین ئیمپراتۆری ئێران.

### ڕووخانی لەناکاوی دەوڵەتی ماد

**کورووش** لە تەمەنی ٤١ ساڵی لە ساڵی ٥٥٨ی پێش زایین لە پارس لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت. کورووش کە سروشت و ناخی ئادەمیزادی باش دەناسی و زۆر بەباشی لە هێزە سیاسیە نێودەوڵەتییەکانی ڕۆژگاری خۆی تێدەگەیشت، بەمەی زانی کە زۆربەی کاربەدەستان و گەورە پیاوانی ماد کە لە ژێرفرمانی **ئاستیاگ** (**ئیشتوو ڤیگوو**) ی کوڕو جێگری کیاکسار (هوەخشترە) دابوون لە پاشای نوێ ڕازی نەبوون. ئاستیاگ کە بەقەد کیاکسار لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئیمپراتۆری شیاو و لێهاتوو نەبوو، پێدەچوو زۆربەی کاتەکان لە دیوان و کۆشکی شکۆداری ماد لە ئیکباتان (هەمەدان) سەرگەرمی ڕابواردن بووبێت. هەروەها دەیزانی ئەو هۆزانەی کە لە ژێر فەرمانی ئیمپراتۆرییەتی ماد دابوون دەبوایە سەربازانی سوپای ماد دابین بکەن، جابۆیە لەم بارودۆخە زۆر ناڕازینە و ئەگەر بێت و هێرش بکاتە سەر ئاستیاگ ئیتر پاڵپشتیان لێ نەدەکرد. کورووش هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە لەلایەنە لاوازەکانی دوژمنانی خۆی دەکۆڵییەوە، بەبێ دەنگی هەڵدەستا بە دانانی پلان دژ بەوانەوەو یەکەمین هەنگاوی خۆی لە ساڵی **٥٥٣**ی پێش زایین هەڵبڕی. لە بابەت شۆڕشی پارسەکان دژ بە مادەکان، کە بە

سەرکردایەتی کورووش بەرپابوو، زانیارییەکی زۆرمان لەبەر دەست دانیە. بە پێی نووسراوەکانی **هیرۆدۆت**:

*ئاستیاگ بەخێرایی مادەکانی کۆکردەوە و ئەوەندە شێوا بوو، کە هارپاگی بە سەرکردایەتی کردنی سوپا هەڵبژارد... بەم جۆرە کاتێك سوپاکەی رووبەڕووی سەربازانی پارسی بوونەوە تەنیا چەند کەسێك... خۆیان بە کوشتن دا و ئەوانی تر هەندێکیان لایەنی پارسەکانیان گرت، بەڵام بەشی هەرە زۆری سوپای ماد پشتیان لە دوژمن کرد. ئاستیاگ ئاگاداری شکستی سەرشۆڕانەی سوپاکەی بۆوە، سوێندی خوارد هەرگیز لێنەگەڕێ کورووش ئارام بگرێ. پاشان گشت مادەکان، چ ئەو کەسانەی کە تەمەنی سەربازیان هاتبوو و چ ئەو بەساڵاچووانەی کە هێشتاش لە شار دەژیان، بانگەشەی خزمەتی سەربازی کران و بەپشتبەستن بەم کەسانەوە پێی نایە ناو مەیدانی جەنگ، بەڵام شکستی خوارد، سەربازەکانی کوژران وخۆی بەدیل گیرا*[١٥].



**ئەم کێلە بەردییە کە بۆ بیرئانیینی کورووش بەرز ڕاگیراوە، یەکێك لەو شوێنەوارە دێرینە دەگمەنانەیە کە لە وێرانەکانی کۆشکی ئەو لە پاسارگاد ماوەتەوە.**



بەم چەشنە ئیمپراتۆرییەتی ماد کە تازە دامەزرا بوو، لەناکاو بەدەستی کورووش لەناوچوو. بەڵام نیشتمانی ماد وێران نەکرا. کورووش وەکوو فەرمانڕەوایەکی گەورە بە ئاسانکاری نواندن و بیرمەندییەوە ڕێزی لە مادەکان گرت. زۆربەی خاوەن شکۆکان و ناودارانی ماد لەناو دیوان و کۆشك و سوپای ئەودا بوونە خاوەن پلەوپایەی بەرز و ڕێزیان لێگیرا. کورووش وڵاتی مادی بە یەکەمین ویلایەت یان ساتراپی ئیمپراتۆرییەتی خۆی داناو ناوی ((**مادا**)) ی بۆ داناو ئێکباتانی بێدەستکاریکردن دوای پاسارگاد کە لە فارس بوو بە پایتەختی دووەمی خۆی دانا. بەم جۆرە لەمەو بەدواوە ئیمپراتۆرییەتی ئێران ((ئیمپراتۆرییەتی **مادو پارس**))ی پێگووترا. جگە لەوە کورووش سەبارەت بە دوژمنی دێرینی خۆی واتا ئاستیاگ گەورەیی و لێبووردنێکی زۆری نواند. بەوپەڕی ڕێزو گەورەییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردو دەرفەتی پێدا تاکوو بۆ هەمیشە لەناو کۆشك و دیوانی فەرمانڕەوایی ئەودا بمێنێتەوە. کورووش بەم جۆرە ڕەفتارانەی سیمای جەنگاوەرێکی بەتوانا و فەرمانڕەوایەکی بەرێز و دادپەروەری بەرجەستەکرد و بەم چەشنە لایەنی سەرنج و وەفاداری و ستایشکردنی خەڵك و لایەنگرانی بۆ خۆی ڕاکێشا.

## سیستەمی سەربازی و سیاسی

کورووش بە داگیرکردنی نیشتمانی ماد بووە فەرمانڕەوای سەرجەم ئەو هەرێمانەی کە لەژێر دەسەڵاتی ئاستیاگ دابوون. بۆ نموونە زۆربەی سنوورەکانی نیشتمانی ئاشوور، ئەرمینیای شاخاوی، سووریا کە دەکەوتە کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست و بەشێکی زۆری بانی ئێران. لەوانەیە بیروباوەڕ بە چارەنووسی ئاسمانی و باوەرهێنان بە خواوەندی ئێران، بووبێتە ڕێگە پیشاندەری. کورووش خەونی بە بەرفراوانکردنی سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆیەوە دەبینی. بەڵام بە باشی دەیزانی کە گەیشتن بەم ئاواتە پێویستی بە بەهێزترین و کاراترین سیستەمەکانی سەربازی و سیاسی هەبوو کە تاکوو ئێستا ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەخۆیەوە بینیویەتی. بەم جۆرە بە هەوڵ و تێکۆشان سەرقاڵی بەهێزکردنی ئەم دوو سیستەمە بوو.

سیستەمی سوپای کورووش تاڕادەیەکی زۆر لە سیستەمی سەربازی ئاشوورییەکانەوە وەرگیرا بوو، ئەگەرچی ئەم سیستەمەی گۆڕی و گەشەی پێدا. ئاشوورییەکان زۆربەی ئەو تاکتیکە سەربازییە کارایانەیان بەکاردەبرد، کە بۆ ماوەی چەندین سەدە لە جەنگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا باوبوو. ئەم تاکتیکە لەسەر بنەمای بەکاربردنی جووتە تیرهاوێژێك دانراوە یەکێکیان ڕمهاوێژێکە کە قەڵغانێکی گەورە و سووك و پتەوی لە جلد و حەسیر

دروستکراوی پێیەو ئەوی تریان کەوانداڕێکی تیرهاوێژە. رمهاوێژ رووبەڕووی دوژمن دەبۆوە و قەڵغانی بەدەستەوە دەگرت. تیرهاوێژ لە پشت رمهاوێژ خۆی دەشاردەوە و بارانی تیری بەرەو رووی دوژمن دەباراند. ئێرانییەکان بە قەڵغانیان دەگووت ((**ئێسپارا**)) و ئەم یەکە تاکتیکانە ((**ئیسپارابارا**)) [سوپەر بارە یان سوپەردار] یان پێدەگووترا. ئاشوورییەکان بەزۆری ئەم یەکانەیان لە تەك یەکتری لە دوو ریز دادەمەزراند، ریزی یەکەم سوپەرداران و ریزی دووەم تیرهاوێژان بوون. کورووش ناوەند و هەروەها ژمارەی تیرهاوێژانی لە ژمارەی سوپەرەکان زیاتر کردو ناوەندێکی بەهێزو کاراتری لە تیرهاوێژان بەدی هێنا.



**نەخشی هەڵکەنراوی ریزی لەشکری کەواندارانی ئیمپراتۆری، کە لە سەر دیواری خشتی لە کۆشکی شووش نەخشێنراوە. هەرکام لەو سەربازانە کەوانێکی چەماوە و تیردانێك و پێدەچێت خەنجەرێکیان پێ بێت.**

سیستەمی سەرەتایی یەکەی سەربازانی پارسی لەسەر بنەمای سیستەمی دەدەیی دامەزرابوو. زانای کلاسیك **نیك سێکووندا** Nick Sekunda دەڵێت:

*سوپای ئێران لە کۆمەڵە یەکەیەکی هەزار کەسی دامەزار بوو. ((هەزار بام)) زاراوەی پارسی کۆنی ئەم یەکە هەزار کەسییانە بوو. فەرماندەی هەرکام لەم هەزار بامانە ((هەزار پاتیش))ی پێدەگووترا، هەرکام لە یەکە هەزار کەسییەکان بەسەر دە ((ساتابا)) یان فەوجی سەد کەسی دابەش دەکرا. فەرماندەی هەر ((ساتابا)) یەك ((ساتاباتیس)) بوو و هەر ((ساتابا))یەکیش بەسەر دە ((داتابا)) کە لە دە کەس پێك دەهات، دابەش دەکرا.*



*((داتابام)) [ یان یەکەی دە کەسی] بچووکترین یەکەی تاکتیکی پیادەبوو کە بە یەك ستوون بەرەو مەیدانی جەنگ رەوانە دەکران. ((داتا پاتیس)) [ یان فەرماندەی یەکەی دەکەسی] لە پێشەوەی ستوون رادەوەستاو ((ئیسپارا)) [سوپەر]ێکی هەڵدەگرت لە پشتەوەی فەرماندەی دە کەسی سەربازەکانی تری ((داتابا)) بە شێوەی ستوونی نۆ کەسی رادەوەستان و هەرکامیان بە تیروکەوان و شمشێری خوار پڕچەك بوون. بەزۆری ((داتاپاتیس)) قوتەڕمێکی سووکی بەدەستەوە دەگرت و سەرۆکایەتی و هەروەها پاراستنی ( داتابام )ەکانی تری بە ئەستۆ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی سەربازانی ((داتابام)) بە تیروکەوان پڕچەك بوون و ((ئیسپارا)) [سوپەر] وەکوو ((دیوارێك)) لە پێشوەی ستوونی سەربازان بەرگری لێدەکردن و ئەو بارودۆخەی بۆ دەرەخساندن تاکوو گشت سەربازانی ((داتابام)) بەدەستی کراوە تیر بهاوێژن یان بە شمشێر بجەنگن[١٦].*

سیستەمی دەدەیی بۆ یەکەکانی گەورەتر لە یەکەی هەزار کەسیش بەکاردەبردرا. سوپا گەورەکان لە یەکە دە ((هەزارابا)) یان دە هەزار سەربازی پێکدەهاتن. زاراوە فارسییە کۆنەکەی ئەم یەکە گەورانە لەناوچووە، بەڵام بە زمانی یۆنانی Myriad ی پێگووتراوە. لە شاهنامەی فیردەوسی دا لە بەرامبەر ئەم زاراوە یۆنانییە ((بیوور)) بەکارهاتووە. گرنگترین یەکە ((دە هەزار کەسییەکان)) [یان ((بیوور)) ] ی ئێرانی ئەو گرووپە هەڵبژاردراوانە بوون، کە هێز یان لیوای ئیمپراتۆریان پێك دێنا بۆ پاراستنی فەرمانڕەوا. باشترین سەربازانی سوپا لەناو ئەم لیوایەدا کە بە ((ئامرتێکا)) [نەمر یان ((یەکەی نەمر)) ] بەناوبانگ بوون خزمەتیان دەکرد. هۆی ناونانیان بە یەکەی نەمر ئەوەبوو هەرکە یەکێك لە سەربازەکان دەکوژرا یان دەمرد، سەربازێکی تر شوێنی دەگرتەوە.

***جۆری چەك و جلوبەرگی سەربازانی ئێران***

***هێرۆدۆت** لە کتێبی **"مێژووەکان"** دا بە درێژی باسی لە جۆری بەرگ و چەکی سەربازانی پیادەی ئێران کردووە:*

*بەرگی سەربازانی ئەم سوپایە بریتی بوو لە کڵاوێکی نەرمی لبادی، تەنپۆشێکی گوڵداری باسکدار، زرێیەك کە کۆمەڵە زنجیرێکی وەکوو پوولەکەی ماسی پێوە شۆڕبۆوە و وەکوو چاکەتێك لەسەر تەنپۆشەکە دەیانکردە بەر، و شلوارێك. قەڵغانێکی حەسیری سووك، تیردانێك، قوتەڕم، کەوانێکی پتەو و بەتین و کۆمەڵە تیرێك کە لە قامیش دروووست دەکرا و هەروەها خەنجەرێکیش چەکی ئەم سەربازانە بوون.*

کورووش جگە لە یەکەی سەربازی پیادە یەکەی تاکتیکی تریشی بەکاردەبرد. سەرەتا پشتی بە سیستەمی سوارچاکان دەبەست کە لە شێوەی یەکەکانی سوپای ماد دامەزرابوون،

ئەم یەکە سەربازییانە کۆمەڵە سوارچاکێکی کارامە بوون، کە لە رۆژهەڵاتی ناوەند دا بێ هاوتابوون. بەڵام پاش ماوەیەکی تر هێزێکی هەڵبژاردراو لە جەنگاوەرانی سوارچاك لە توێژی رەسەنزادە ئێرانییەکان پێکهات. هەروەها لە سیستەمی بەهێزو سەرەکی سوپای کۆنی ئاشوور واتا یەکە عارەبانە جەنگییەکانیش بەهرەمەند بوو. بەڵام ئەو گۆڕانانەی کە لە شێوەی ئەم عارەبانانە کرا، وای لە بەکارهێنەران کرد، کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ زۆرترین زیان بە ڕیزەکانی دوژمن بگەینن، **گەزنەفۆن** مێژوونووسی سەدەی چوارەمی پێش زایین لە بابەت ژیانی (کورووش)ەوە دەڵێت:

*کورووش جۆرە عارەبانەیەکی جەنگی سازکردبوو، کە تایەکانی پتەو و توونـد بوون و بە ئاسانی نەدەشکان. پارچە دارێکی درێژ ئەم دوو تایەی لێك دەبەستەوە و بەهۆیەوە دەیتوانی لەسەر هەر جۆرە جادە یان ئاستێك بهاژۆترێت بێ ئەوەی وەرگەڕێت. شوێنی عارەبانەچی لە داری پتەو و توونـد لە شێوەی ئەندازەیی هیرەمی درووستکرابوو و بەرزیەکەی ئەوەندە بوو، کە عارەبانەچی بە ئاسانی بتوانێ ئەسپەکان ڕێبەری بکات. هەروەها بێجگە لە چاوەکانی سەرجەم جەستەی عارەبانەچی زرێپۆش کرابوو. جگە لەوە لە هەردوو سەری ئەو دارەی کە لەناو تایەکاندا تێدەپەڕی کۆمەڵە داسێکی پۆڵایی دادەنرا... بە جۆرێك کە ریزی ستوونی دوژمنانی هەڵدەقەڵێشی*(١٧).



**کورووش (لەسەر تەخت دانیشتوە) راوێژکارانی جەنگی لە یەکێك لە ژوورەکانی ناو کۆشك کۆکردووە.**



بە شێوەیەکی گشتی خزمەتکردن لەناو یەکە سەربازییە سوارچاکەکان و پیادەو عارەبانەکان بۆ گشت کۆمەڵانی خەڵکی ئێران هەم بۆ رەسەنزادەکان و هەمیش خەڵکی ئاسایی، ئەرك و ئیجبار بوو. هەر تاکێکی نێری تەمەن بیست تاکوو بیست و چوار ساڵانە دەبوایە لە خولی مەشقی جەنگی دا بەژدار بێت و بڕواتە ناو مەیدانی جەنگ، زۆربەشیان بۆ ماوەیەکی زۆر کە تاکوو پەنجا ساڵیشی دەخایاند لەناو ریزی سوپادا دەمانەوە.

هەروەها کورووش سیستەمی سیاسی ئیمپراتۆرییەتەکەی بە پێی بنەما ئاشوورییەکان دامەزراند، ئەگەر چی گۆڕنکارییەکی زۆر باشی تێداکرد. ئاشوورییەکان سنووری فەرمانڕەوایی خۆیان بۆ سەر کۆمەڵە ویلایەتێك دابەش کردبوو، کە هەرکام لە ویلایەتەکان لە لایەن فەرماندارێکەوە بەڕێوە دەچوو و راستەوخۆ پەیوەندی بە نەینەواو دیوانی پاشا دەکرد. کورووشیش بەم جۆرە کۆمەڵە **ساتراپییەکی** دامەزراند و هەرکامیان پێکهاتبوون لە هەرێمێکی جوگرافیایی و کولتووری کە لە نەتەوە ژێرکەوتووەکان پێکدەهاتن. **ساتراپ** یان **شارەوان** کە بە واتای ((**پارێزەری هەرێمی پاشایەتی بوو**)) و بۆ بەڕێوەبردنی ساتراپی هەڵدەبژێردرا دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو. دەسەڵاتێك کە بە ڕادەی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا لە دەوڵەتی ناوەندی بوو، بەڵام کورووش چاودێری دەسەڵاتی ئەوانی دەکرد. ساتراپ دەیتوانی بۆ بەڕێوەبردنی بارودۆخی ویلایەتەکەی سەرۆکایەتی سوپا سەربازییە خۆماڵییەکان بە ئەستۆ بگرێ. بەڵام راوێژکارێك کە ئەفسەری کاروباری دارایی و سەرۆکی سەربازخانەی پاشایەتی لە پایتەختی ویلایەت بوو، راستەوخۆ گوزارشی کاروبارەکانی بۆ ئیمپراتۆر رەوانە دەکرد. جگە لەمەش باندێکی سیخوڕی لەناو ویلایەتدا بۆ کورووش کاریان دەکرد کە هەواڵی رووداوە گرنگەکانی ناوچە دوورەکانیان بۆ ڕەوانە دەکرد.

## هێرشکردن بۆ لیدیا

ئاشکرایە کە سیستەمی سەربازی و سیاسی بەهێزی کورووش کلیلی سەرکەوتنی ئەو بوو، بۆ بەرەوپێشبردن و بەرفراوانکردنی سنووری ئیمپراتۆرییەتێکە کە لە مادەکانەوە بۆی بە میرات  مابۆوە. لەناوچوونی ماد نە تەنیا کۆمەڵە نیشتمانێکی دەرەوەی خستە ژێر دەستی کورووشەوە، بەڵکوو دەسپێکەك بوو بۆ هاوسەنگی دەسەڵات لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. سێ زلهێزی تری ناوچەکە، میسر، بابل و لیدیا کورووشیان بە پاشایەکی تازە پەیابوو دادەنا، کە مەترسی دەخستە سەر ئاسایشی ئەوانەوە. لەگەڵ هێرشی نەترسانەی کورووش بۆ سەر لیدیا لە ساڵی ٥٤٦ی پێش زایین بەدیارکەوت، کە ئەوان بە باشی لەم مەترسییە تێگەیشتبوون. کورووش دەیویست پیشان بدات، کە لە کیاکسار بە تواناترە، ئەو کیاکسارەی کە بە هۆی بیروباوەڕێکی خورافی زۆر بە ئاسانی وازی لە لیدیا هێناو گەڕاوە. کورووش پاشای گەورەی ئێران وەکوو فەرمانڕەوای پێشووی ماد زۆر باوەڕی بە فاڵ و بەخت و نەهات نەبوو و رۆژگیران ترسێکی نەخستەناو دڵی بۆ سەرکەوتن بەسەر جیهاندا.



**پێشگۆی پەرستگەی دێلفی ( بەدەستی هەڵگردوو ) خەریکی پێشگۆیی کردنە بۆ میوانەکان.**

گاڵتەی چارەنووس ئەوەبوو کە باوەڕهێنان بە پێشگۆیی دەورێکی گرنگی لە هێرشکردنی کورووش بۆ سەر لیدیادا هەبوو. ئەمجارەیان **کرۆزووس** Croesus ی پاشای نوێی لیدیاو کوڕەکەی **ئالیاتێس** Alyattes ڕێگەی بە هێزی خورافات دا تاکو چارەنووسەکەی دیاری بکات. کرۆزووس ڕێزی لە یۆنانییەکان بە تایبەتی ئیونیەکان دەگرت و باوەڕی بە داب و نەریت و ڕێڕەسمەکانیان هەبوو. یەکێك لە نەریتەکانی یۆنانییەکان مشتومڕکردن لەگەڵ پێشگۆی ناوداری پەرستگەی شاری دێلفی بوو. ئەو شارەی کە دەکەوتە ناوەندی یۆنانەوە. لە کاتی مەترسی یان گرفت کە تووشی شڵەژان دەبوون، لەگەڵ ئەم پێشگۆیە مشتومڕیان دەکرد. پێشگۆی ئەم پەرستگەیە کاهینێك بوو، کە هەموو باوەڕیان وابوو، پەیوەندی لەگەڵ خواوەندەکاندا هەیە، بە بەرەڤانی نێوان مرۆڤ و خواوەندەکان دادەنرا و لە کاتی تەنگانە دەیتوانی پێشگۆیی بکات. بەم چەشنە کرۆزووسیش بە پێی نەریت نێردراوێکی بۆ لای پێشگۆ ڕەوانەکرد و لێی پرسی ئایا بە باش دەزانی کە ڕووبەڕووی کورووش ببێتەوە یان نا. پێشگۆ وەڵامی داوە کە ئەگەر فەرمانڕەوای لیدیا لە ڕووباری **هالیس** Halys **(قزل ئیرماقی**



هەنووکەیی کە دەکەوێتە خاکی تورکیا) لە ئاسیای بچووك تێپەڕێت و بەسەر ئێرانییەکان دابدات، ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە لەناو دەبات. بەم چەشنە کرۆزووس بە دڵنیاییەوە لە ڕووباری هالیس تێپەڕی و بەسەر سوپای کورووشی دادا. بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە زانی کە ناتوانێت سوپای بەهێزو بە توانای کورووش لەناو بەرێت. لیدیاییەکان دوای ئەم شکستە کاتیە بەرەو ساردی پایتەختی خۆیان کشانەوە، کە دەکەوتە دەورووبەری هەشت کیلۆمەتری کەناری دەریای ئێژە (ئیجە). بە پێچەوانەی بۆچوونی لیدیاییەکان، کورووش بەخێرایی بەدوایان کەوت و هەردوو سوپاکە جارێکی تر ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە. ئەمجاریان بە پێی نووسراوی **هیرۆدۆت:**

*دەشتێکی بەرفراوانی وشك و بێ دارودەوەن دەکەوتە بەرامبەر شاری سارد... چونکە لیدیاییەکان لەناو ئەم دەشتە بەرفراوانەدا سوپا و سەربازەکانیان ڕیز کردبوو، کورووش لەبەر ترسان لە یەکەی سوارچاکانی لیدیاکان پێشنیاری هارپاگی مادی پەسندکرد. پاشان سەرجەم وشترەکان کە تایبەت بە گواستنەوەی کەلوپەل و خۆراك بوون کۆکرانەوەو بارەکانیان لێ کەواندن و سەربازەکان سوار کران تاکوو بەرەو پێشەوەی بەرەی جەنگ ڕەوانە بکرێن. هەروەها فەرمانی دا سەرەتا بەسەر سەربازانی پێشڕەوی کردووی سوپای کرۆزووس دابدەن، دوایی سەربازانی پیادەو پاشان سوارچاکانی لیوای ئیمپراتۆری بەرەو پێشەوە پێشڕەوی بکەن... هۆکاری ڕووبەڕووکردنەوەی یەکەی سوارچاکی دوژمن لەگەڵ وشترەکان، هەڵچواندنی ترسی غەریزی ئەسپ لە وشترە. هیچ ئەسپێك بەرگری دیتن یان بۆنکردنی وشتری نییە... ئەم پلانە زۆر کاریگەر بوو، هەرکە جەنگ دەستی پێکرد و ئەسپەکان چاویان بە وشتر کەوت و هەستیان بە بۆنی ئەم ئاژەڵە کرد، ڕەوینەوەو هەڵاتن. بەم جۆرە تەنیا دڵگەرمی و ئاواتی کرۆزووس لەناوچوو، بەڵام لیدیاییەکان ڕەشادەتیان نواندو لە بەرامبەر ئەم بارودۆخە بە چالاکی لەسەر زینی ئەسپەکانیان خۆیان هەڵدا و ڕووبەڕووی ئێرانیەکان بوونەوە. هەردوو لایەنەکە زەرەرو زیانی زۆریان بەرکەوت، بەڵام لە کۆتاییدا لیدیاییەکان شکستیان خوارد و پەنایان بردە ناو ئاکرۆپۆلیس و ئێرانییەکان ئەوانیان گەمارۆدا [١٨].*

لە ڕاستیدا کورووش بە بەکاربردنی تاکتیکی گەمارۆدان، کە تاکتیکێکی تری سەربازی بوو و لە ئاشوورییەکانەوە فێربووبوو، ساردی گرت و لیدیا بووە ساتراپیەکی تری ئێران. کرۆزووس باوەڕی بە پێشگۆیی پێشگۆی پەرستگەی دۆڵفی کردو شکستی خوارد. بەڵام بەو جۆرەی کە **هیرۆدۆت** ئاماژەی پێدەکات، دەیتوانی بەهۆی بەختڕەشی خۆی بەتووندی پێشگۆکە سەرزەنشت

بکات، چونکە؛ خواوەند گووتبووی ئەگەر بەسەر ئێرانییەکان دابدات ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە لەناو دەبات. پیاوی زانا دەبێ دوای ئەم وەڵامە دووبارە بپرسێتەوە کام ئیمپراتۆرییەت، ئیمپراتۆرییەتی خۆم یان کورووش ؟ بەڵام ئەو شتەی کە بیستبووی بە سوودی خۆی راڤەی کردبوو و دووبارە نەیپرسیبۆوە. لەم رووەوە دەبوایە ئەم شکستە بە ئەنجامی هەڵەی خۆی بزانێ[١٩].



**کرۆزووسی ئیمپراتۆری لیدی لایەنگر و هاندەری یۆنانییەکان بوو. هیرۆدۆت کۆمەڵە چیرۆکێکی سەبارەت بەم ئیمپراتۆرە دڵتەڕە گێڕاوەتەوە.**



## یەکەمین پەیوەندی نێوان ئێرانییەکان و یۆنانییەکان

لەناوچوونی لیدیا بەواتای سەرکەوتنی کورووش بەسەر دووەمین دەسەڵات لە چوار زلهێزی ناوچەکەبوو. وەکو بومەلەرزەیەکی گەورە سەرتاسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گرتەوە. سەرکەوتنی ئێران، شارە یۆنانینشینەکان واتا **ئیونییەی** کەناری دەریای **ئێژەی** کە ئێستا راستەوخۆ ڕووبەڕووی بەرەکانی سوپای کورووش ببوونەوە، بە تەواوی سەرسام کرد. بەوپەڕی بێ هیواییەوە داوای یارمەتیان لە **ئیسپارت** کرد. ئیسپارت ئەو **دەوڵەت- شارە** بوو، کە نیمچە دوورگەی **پلۆپوونێزی** لەدەست دابوو، نیمچە دوورگەیەك کە یەك سێیەمی باشووری یۆنانی دەگرتەوە. گشت یۆنانییەکان لە لەشکرە بچووك، بەڵام تۆقێنەرەکەی ئیسپارت دەترسان و هاوکات بە سوپایەکی نەبەزیشیان دادەنا و ڕێزیان لێدەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا ئیسپارتییەکان بەوە ناسرابوون، کە هەرگیز لە هەرێمەکانی دەرەوەی نیشتمانی خۆیان ناجەنگن، جابۆیە سوپای خۆیانیان رەوانە نەکرد[٢٠]. بەڵام بوێرانە نێردراوێکیان رەوانەی لای کورووش کردو هەڕەشەیان لێکرد و پێیان ڕاگەیاند، ئەگەر بوێرێت و بەسەر شارە یۆنانییەکان دابدات رووبەڕووی هەڵوێستی ئیسپارت دەبێتەوە.

بۆ فەرمانڕەوای بە توانای ئێران کە بەسەر چارێگێکی جیهانی ناسراوی ئەوسا فەرمانڕەوایی دەکرد، دەوڵەت- شارە یۆنانییەکان لە کۆمەڵە دێهاتێك گەورەتر نەبوون، کە لە چواردەوری شارستانییەتێك دا کۆببوونەوە، و ناوەناوە لەگەڵ یەکتری دەجەنگان. بۆ نموونە دەیزانی مەزنترین دەوڵەتە یۆنانییەکان، سوپاکەیان زۆرتر لە چەند هەزار سەربازی تێدا نەبوو و ژمارەی سەربازی سوپای زۆربەیان نەدەگەیشتە چەند سەد کەسێك. بەم چەشنە هەڕەشەی ئیسپارتییەکان بۆ کورووش هەم گاڵتەجارانەو هەم پەستیهێنەر بوو. بە نێردراوی ئیسپارتی گووت: "من هەرگیز لەو کۆمەڵە خەڵکە ناترسێم، کە لە ناوەندی شارەکەیان شوێنێکی تایبەتیان هەیە تاکو لەوێدا بە سوێندخواردن و زۆرڕەوی یەکتری لە خشتە ببەن. ئەگەر رووبەڕووی ئەم جۆرە کەسانە ببمەوە، تەنیا بەو زیانانەی کە بەر ئیوونییەکان دەکەوێت دڵ نیگەران نابن، بەڵکوو تووشبوون و کێشەکانی خۆیانیش سەرچاوەی بیرکردنەوەیان دادەخات.[٢١]" [هیرۆدۆت بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "مەبەستی کورووش لە راگەیاندنی ئەم پەیامە رەخنەیەکی گشتی لە رەفتاری سەرجەم خەڵکی یۆنان بوو، چونکە ئەم خەڵکە بۆ ئاڵوگۆڕی کەلوپەل گۆڕەپان و بازاڕی تایبەتیان هەبوو." کەچی ئێرانییەکان بازاڕێکیان نییەو منداڵەکانیان لە رۆیشتن بۆ بازاڕ دەپارێزن تاکو فێری درۆ و فریووکاری نەبن ــ ].

***كۆكردنەوەی پێداویستی بۆ سوپا لە كاتی جەنگ***

*ئەم بەشە لە كتێبی* ***"پەروەردەكردنی كورووش"*** *نووسراوی ((* ***گەزنەفۆن*** *)) وەرگیراوە. لەم نووسراوە دا پاشای ئێران فرمانی دابوو پێداویستییەكانی سوپا بۆ كاتی جەنگ ئامادە بكەن و پیشاندەری جۆری پێداویستییەكانی سوپای ئەو سایە.*

*"ئەگەر یەكێك جل و بەرگی تەواو و باشی پێبایە چ لەكاتی تەندروستی و لەكاتی نەخۆشی بۆی بەسوود بوو... ئێمە دەبوایە ئەو شتانەمان لابوایە كە كەسی نەخۆش پێویستیان پێ دەبوو، چونكە كێشێكی زۆریان نەبوو و ئەگەر نەخۆشییەك ڕوویدات زۆر بەسوود دەبوو. هەروەها دەبوایە گوریسی زۆر توندمان پێ بایە، چونكە ئەم گوریسانەیان لە سەرجەم كەسەكان و ئەسپەكان توند دەبەستەوە و ئەگەر بپسابان یان ڕزیبوبان یان لەم ناوەیە شتێك شكابا، هەموو چالاكییەكان دەوەستان... هەروەها دەبوایە دارو كەلوپەلی پێویست بۆ عارەبانە و عارەبانە باریەكانمان پێبا، چونكە دوای ماوەیەك بەكاربردنیان تێكدەچوون. كەلوپەلی پێویست بۆ نۆژەنكردنەوەش پێویست بوو... جگە لەمانەش دەبوایە پێمەرەیەكمان پێ با، و بۆ هەر كام لە عارەبانەو پۆلی گیانلەبەرەكان تەورێك و داسێك پێویست بوو... چاودێران و سەرپەرشتانی یەكەی ئەندازیاری لە پێشەوەی عارەبانەكان بەرێ دەكەوتن. لە كاتێكدا ئەگەر پێویست بەوە ببا كە جادەیەك درووست بكرێ، بەخێرایی دەست بەكاركردن دەكرا... لەم ناوەدا... ئاسنگران، دارتاشان و پینەچییەكانیش بەرچاو دەكەوتن و..."*

دواتر كورووش بۆ وەڵامدانەوەی قسە گەورەكانی ئیسپارت شارە یۆنانییەكانی گەمارۆدا. ئەو شارانەی كە بە هۆی دژایەتی نەیاندەتوانی یەك بگرن. بە هۆی خێرابوونی سوپای كورووش ، ئیسپارتیە كەللە ڕەقەكان هیچیان پێ نەكرا و نەیانتوانی یارمەتی یۆنانییەكانی تر بدەن. ئیوونییە زۆر زوو شكستی خوارد و بە ناچاری باجی ساڵانە (وەكو زێڕ و كەلوپەلی بەنرخی تر)و هەروەها دابینكردنی سەرباز بۆ سوپای كورووش بەسەر دا سەپێنرا. یەكەمین پەیوەندی گرنگی نێوان ئێران و یۆنان لەو ڕۆژگارە كاری كردە سەر هەردوو نەتەوەكە و لە چاو یۆنانییەكان ئەم پەیوەندییە دەرسێكی زۆرتری بە ئێرانییەكان دا. بە پێی نووسینی **ئۆمستێد:**






*ئێرانییەكان زانیان سەربازانی [یۆنانی] جەنگاوەرانێكی زۆر بەتوانانە و بە باشی پڕ چەكن و دەتوانن یەكێتییەك لەناو سوپاكانیان دروست بكەن. هەروەها بەوەیان زانی دەوڵەت- شارەكانی یۆنانی، كە دژومنی یەكترن و ئیرەییان بە یەكتری دێت، توانای ئەوەیان نییە یەك بگرن و كرێنی بەكرێگیراو و خۆفرۆشان لەناو ئەمانەدا زۆر ئاستەنگ نییە... بەڵام گرنگترین دۆزینەوەیان ئەوەبوو كە لەناو ئەم دەوڵەت- شارانەدا دابەشبوون و دژایەتی چینایەتی لە ئارادابوو و [ئێرانییەكان دەیانتوانی لە ڕێگەی بەرتیلپێدان یان ڕێگەی تر، توێژێك دژی توێژێكی تر هەڵچوێنن]* (٢٢).

## كورووشی سەركەوتوو

كورووش دوای سەركەوتنەكانی لە ڕۆژئاوا، بەرەو فارسی نیشتمانی خۆی لە ئێران گەڕاوە و دەستی بە دروستكردنی كۆشك و بینای فەرمانڕەوایی لە ناوچەی **پاسارگاد** كرد. زۆربەی ئەو بەردتاشانەی كە سەرقاڵی دروستكردنی ئەم بینایانە بوون، كرێكارانی كارامەی لیدیایی و یۆنانییەكانی ئیوونییە بوون، كە كورووش لە ساتراپییە نوێكانی ئاسیای بچووك هێنابوونی.

دوای تێپەڕینی ماوەیەکی کەم فەرمانڕەوای گەورە سەرنجی ڕۆژهەڵاتی داو سوپاکەی بەرەو سەرزەمینی گەلانی ئێرانی دانیشتووی باکوورو ڕۆژئاوای دەشتی کەویری ناوەندی ئێران بە تایبەتی **نیشتمانی ئاریا** [هەراتی ئێستا] ڕەوانە کرد، کە هێشتا خۆیان بە دەست فەرمانڕەوایەتی ئەو نەدابوو. دواتر بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات و دۆڵەکانی ڕووباری **ئۆکسووس (جەیحوون)** کە دەڕژایە ناو دەریاچەی **ئاراڵی** نزیك سێ سەد میلی ڕۆژئاوای دەریای **مازەندەران،** بە ڕێکەوت. نیشتمانی **باکتێریا [بەلْخ]** کە بەدرێژایی ئاراستەی لێواری ڕۆژئاوای ڕووباری **جەیحوون** هەڵکەوتووە، بەرلەوەی سوپای مەزنی پارسی بگاتە ئەوێ ڕووخا. بە جۆرێك کە ناوچەی باکووری ڕۆژئاوای هیندوستان ناسراو بە **قەندەهار** (گاندارا یان گاندارای تیس Gandara (Gandaritis) یش هەر زوو تووشی ئەم کارەساتە بوو.

کورووش لە کۆتاییەکانی ساڵی ٥٤٠ی پێش زایین بە هۆی ئەو دەستکەوتانەی کە لە ڕۆژهەڵات دەستەبەری کردن، ڕووبەری ئیمپراتۆری خۆی دوو بەرامبەر زیاتر کرد. هەروەها بەوەی زانی، کە متمانەکردن و پشتبەستن بە بابل کە هاوپەیمانی رابردووی ماد بوو، دەبێ کۆتایی پێ بێت، و لەماوەی چەند مانگێکدا خۆی گەیاندە دەشتە زەنەکە بە پیتەکانی میزۆپۆتامیا. نەبۆنیدی پاشای بابل سوپاکەی کۆکردەوە تاکو ڕووبەڕووی هێرشبەران ببێتەوە، بەڵام ئەو و سوپاکەی توانای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێزە جەنگاوەرەکانی ئێرانیان نەبوو. لە سەرەتاکانی ئۆکتۆبەری ساڵی **٥٣٩**ی پێش زایین (ناوەڕاستی ڕەزبەر) کورووش شاری" **ئۆپیس** Opis"ی کەناری ڕووباری **دیجلە** لە دەوروبەری دوو سەد کیلۆمەتری باکووری **بابلی** داگیرکردو نزیکەی یەك حەفتە دواتر " **گۆبریاس** Gobryas" ی سەرداری سوپای کورووش، سوپای ئێرانی گەیاندە دیوارەکانی پایتەخت. کاهینانی بەتوانای بابل و زۆربەی بەرپرسانی ناوچەیی و کۆمەڵانی خەڵکی ئاسایی دژی نەبۆنید بوون، چونکە لە جێگەی پەرستنی خواوەندی گەورەو ڕەسەن و خۆماڵی شاری بابل واتا "**مەردووك** Marduk" دەستی بە پەرستنی "**سین** si "ی خواوەندی مانگ کردبوو، جابۆیە زۆربەیان پەیوەنیان بە سوپای ئێرانەوە کردبوو. گۆبریاس توانی بێ جەنگ و بە ئاسانی بچێتە ناو شار. زۆربەی بەرپرسان و کۆمەڵانی خەڵکی ناو شار کە ئێرانییەکانیان بە ڕزگارکەری خۆیان دەزانی بە دڵشادی و خۆشییەوە پێشوازیان لێکردن(٢٣).



### پێگەی سوپای ئێران

**گەزنەفۆن** لە کتێبی "**پەروەردەکردنی کورووش** " زانیارییەکانی خوارەوەمان لە بابەت ڕێکخستن و دامەزراندنی پێگەی سەربازی و سوپای کورووش بە دەستەوە دەدات، کە پێدەچێت فەرمانڕەوا و سەردارانی دواتری ئێرانی ئەم شێوازەیان بەکاربردبێت:

"کورووش لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتییەوە وای دانا، کە خێوەتەکەی هەمیشە بەرەو ئاراستەی ڕۆژهەڵات دامەزرێت. دواتر دیاری کرد کە خێوەتی رمهاوێژانی لیوای تایبەتی خۆی چەندە لە دیوانی فەرمانڕەوایی دوور بێت. دوایی لە لای راستی خێوەتەکەی نانەواخانەو لە لای چەپیشی چێشتخانە و لە لای راستی پێگەکە شوێنی بەستنەوەی ئەسپەکان و لە لای چەپی پێگەکە شوێنی چوارپێ و ئاژەڵەکانی تری دیاری کرد و هەموو شتێك ئەوها ڕێکدەخرا، کە هەرکەسێك دەیزانی لە پێگە دا شوێنەکەی بە گوێرەی گەورەیی و هەڵکەوتنی دەکەوێتە چ ئاستێك... چونکە کورووش بایەخێکی زۆری بە ڕێکوپێکی سوپاکەی دەدا. بەخۆیشی لە ناوەڕاستی پێگە دادەنیشت، چونکە پێی وابوو ئەمینترین شوێنە. پاشان نزیکترین یاوەران... و ئینجا پۆلی سوارچاکان و عارەبانەچییەکان لە دەورووپشتی خێوەتی ئەو جێگیر دەبوون... ڕمهاوێژ و تیرهاوێژان بە چەکەوە دەنووستن... تاکو هەرکاتێك کە ڕارودۆخێك بێتە پێشێ بتوانن لەناو تاریکایی شەویشدا بجەنگن... و هەموو ئەفسەرێك لەسەر خێوەتەکەی ئاڵایەکی هەڵدەکرد... [بە چەشنێك کە] دەستیاران یان ئەفسەرانی ژێر فەرمانی کورووش شوێنی ئەفسەرەکانی تریان پێدەزانی و ئاڵای هەرکامیان دەناسییەوە.



**کورووشی گەورە لە سەرەتاکانی مانگی گەلاڕێزانی ساڵی ٥٣٩ ی پێش زایین سەرکەوتووانە پێی نایە ناو بابل. ئەوکات ئەم شارە لە لێواری رووباری فورات ئەوەندە گەورە بوو، کە دیوارێکی گەورەی بەرگری بە بەرزی پازدە مەتر و بە درێژی هەژدە کیلۆمەتر بە دەوریدا راکێشرابوو. یەکێك لە شتە سەیرەکانی ئەم شارە، تاوەری ئەم شارە بوو. بەرزایی ئەم تاوەرە پەنجا مەتر بوو، کە پەرستگەی مەردووکی خواوەندی بابل لەسەر ئەوێ بوو.**

کورووش لە ٢٩ی ئۆکتۆبەر (٧ی گەلاڕێزان) سەرکەوتووانە پێی نایە ناو شار و یەکەمین بەیاننامەی خۆی راگەیاند:

*"منم کورووش ، فەرمانڕەوای جیهان، فەرمانڕەوای گەورە، فەرمانڕەوای بەهێز، فەرمانڕەوای بابل، پاشای سۆمەر و ئەکەد، فەرمانڕەوای چوار کوچکەی جیهان.*[٢٤]"

کورووش بە رووخانی بابل، ئیمپراتۆرییەتی بابل و سەرجەم باشووری میزۆپۆتامیا و زۆربەی ناوچەکانی فەلەستینی خستە سەر سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەی. رووبەری ئیمپراتۆرییەتی کورووش لە رۆژئاواوە لە کەناری دەریای ئیژە دەستی پێدەکرد و لە رۆژهەڵاتەوەش تاکو رۆژئاوای هیندستان دەڕۆیشت. ئێستا تەنیا میسر وەکو تاکە زلهێزی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست مابۆوە، کەهێشتا نەکەوتبووە ژێر دەستی ئێرانییەکان. پلانی کورووش وابوو کە شارستانییەتی نیلیش بخاتە سەر ئیمپراتۆرییەتەکەی. کورووش لە کۆتاییەکانی دەیەی



٥٣٠ی پێش زایین کەمبووجیەوەی کوڕی خۆی بە سوپایەکی گەورەی سەربازییەوە کە کارامەو مەشقپێکراو بوون ڕەوانەکرد، تاکو میسر بگرن.

بەڵام تەمەنی یەکەمین فەرمانڕەوای مەزنی ئێران دەرفەتی پێ نەدا، تاکو بە چاوی خۆی دەستکەوتەکانی ئەم کارە گەورەیە ببێنێ. کورووش لە دەوروبەری ساڵی ٥٣٠ی پێش زایین کە بەرەو رۆژئاوا ڕۆیشتبوو لە دەوروبەری دەریاچەی ئاراڵ لە کاتی جەنگ بریندار بوو و پاشان بە هۆی برینەکەیەوە مرد. لاشەکەیان هیناوە پارساگاد و لەناو گڵکۆیەکی بەردینی سادەو جواندا ناشتیان و تاکو ئێستا وەکو مەزاری یەکێك لە بەرزەفڕترین و بەتواناترین فەرمانڕەوایانی جیهان ماوەتەوە. بە پێی گووتەی " **بائووسانی** Bausani نەرمی نواندن و ئاسانکاری ئایینی، و ئەو رەفتارە شیاو و بە بەزەییانەی کە لەگەڵ دوژمنی ژێرکەوتوو هەیبوو... و کارامەیی و توانایی بێکۆتایی ئەو وەکو فەرماندەیەکی جەنگی، پیشاندەری هۆکاری ئەو ستایشکردنانەیە کە سەرتاسەری جیهان، تەنانەت بابلییەکان و یۆنانییەکان سەبارەت بە کورووش ی گەورە هەیانبووە.[٢٥]". لە راستیدا کەسێکی یۆنانینەژادی وەکو **گەزنەفۆن** پێی وابوو کە "ئەم پیاوە شایانی هەموو جۆرە ستایشکردنێکە"و هەروەها دەڵێت: **"کورووش جوانترین سیما، بەخشندەترین و شکۆدارترین دڵ، ماندوونەناسترین کەس بۆ فێربوون و پڕ ئاواتترین فەرمانڕەوا بوو، بە جۆرێك کە دەیتوانی بەرگەی هەموو جۆرە ناخۆشی و مەترسییەك بگرێ.**[٢٦]" نموونەی ئەو فەرمانڕەوایانەی کە وەکو کورووش دۆست و دوژمن ستایشی دەکەن لە مێژووی جیهاندا زۆر کەمن. جارێکی تر ئێران چاوی بە فەرمانڕەوایەکی وەکو ئەو نەکەوتەوە.

## (٣)

### کەمبووجییە و داریووش: بەرفراوانبوونی ئیمپرتۆری

جێبەجێکردنی سیاسەتی بەرفراوانکردنی سنووری ئیمپراتۆری و چاکسازی سەربازی دوای مردنی کورووشیش بەردەوام بوو. جێگرەکانی، کەمبووجییەی دووەم و داریووشی یەکەم سنووری ئیمپراتۆریان بەرفراوانتر کرد بە رادەیەك، کە ئیمپراتۆرییەتی ئێران تاکو ئەوکات گەورەترین و بەرفراوانترین ئیمپراتۆری بوو. لە رۆژگاری داریووش سنووری دەسەڵاتی هەخامەنیشییەکان گەیشتە زۆرترین رادەی خۆی. داریووشی دەسەڵاتخوازو داهێنەر سەلماندی بەڕێوەبەرێکی لێزان و بەدیهێنەری مەزنی ئەو رێگاوبان وکاناڵ و کۆشکانەیە، کە دەتوانێ شایستەو شایانی ئیمپراتۆرییەتێکی بەهێز بێت. ئەگەرچی پێدەچێت داریووش نەیتوانی کار بکاتە سەر هەموویان. هیرۆدۆت قسەی پارسی زمانێکی کۆن دەگوازێتەوە کە " داریووش بە هۆی سەپاندنی باجی رێکوپێك و کۆمەڵە کارێکی لەم چەشنە... وەکو دوکاندارێك وابوو... و کارێکی نەدەکرد کە سوودی مادی بەدواوە نەبێ.[٢٧]" بێگومان ئەم رستە گاڵتە جاڕانەیە ئەو دیوەی نووسراوی هیرۆدۆتە کە رەگەزپەرستی دژە ئێرانی پێوە دیارە؛ لە کاتێکدا ئەم هەڵسەنگاندنە ناتوانێ بۆچوون و رای پارسی زمانێك بێت، چونکە پارسەکان لە ویلایەتی پارسدا باجیان نەدەدا. لەوانەیە هیرۆدۆت ئەمەی لە یەکێك لەو هاوڵاتییە ئازار چەشتووانەی نەتەوە ژێر دەستەکانی ئیمپراتۆری بیستبێ، کە دەبوایە باج بدات. یۆنانییەکان بەهۆی ئەو هێرشانەی داریوش کردبوویە سەر وڵاتی ئەوانەوە، رقیان لێدەبۆوە و دواتر لە کتێبەکانیاندا زۆر بەخراپی وەسفی داریوشیان کردووە. کە ئەمەش بە گوێرەی سەرنجدان بە تواناو تێکۆشان و زۆربەی ئەو کارە کرنگانەی کە کردوویەتی، نامرۆڤانەیە.

### کەمبووجییە لە میسر

بەراستی کارە گەورەکانی داریووش ئەوەندە زۆرن، کە لە روانگەی مێژووییەوە تاریکاییەکی گەورەی خستۆتە سەر فەرمانڕەوای پێشخۆی کە **کەمبووجییە**یە. ئەمەش تاڕادەیەك بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە **کەمبووجییە**ی گەورەترین کوڕی کورووش تەنیا هەشت ساڵ فەرمانڕەوایەتی کردو ئەو دەرفەتەی بۆ نەڕەخسا تاکو بەڕادەی سەردەمی دوورودرێژی ٣٦





ساڵەی فەرمانڕەوایەتی داریووش خۆی پیشان بدات. لەگەڵ ئەوەشدا دەستکەوتەکانی کەمبووجییە ئەگەرچی لە رووی ژمارەوە کەمن، بەڵام هەرگیز بێ بایەخ نین. کورووش بە کەمبووجییەی راسپاردبوو کە بەسەر میسر دابدات... و ئەویش دوای مەرگی کورووش لەسەر جێبەجێکردنی شاکارە سەربازییەکانی باوکی بەردەوام بوو. لەم شاکارانە دەتوانین ئاماژە بە دامەزراندنی هێزی دەریایی ئێران بکەین، کە دەستکەوتێکی تاکتیکی سەربازی زۆر گرنگ بوو و ئێرانییەکان لەوکات دا دەستەبەریان کرد. کەمبووجییە بەباشی دەیزانی، کە سوپاکەی ناتوانێ بە ئاسانی لە بیابانی وشك، کە وەکو بەربەستێك لە نێوان فەلەستینی جنووبی و دەشتی بەپیتی نیل هەڵکەوتبوو تێپەڕێت، بەڵام ئەگەر کۆمەڵە کەشتییەکی هەبێت و بتوانن لە لێوارەکانی کەنار تێپەڕن و پێداویستییەکانی هێزی زەمینی و پیادە دابین بکەن، تێپەڕین لە بیابان کارێکی ئاسانە و دەشێ ئەم کارە بکرێ. وەرچەرخانی ئێران لەوکات لە دەسەڵاتێکی زەمینی بۆ فەرمانڕەوای دەریا و وشکاییەکان هۆکارێك بوو بۆ بەرفراوانبوون و گرتنی هەرێمەکانی تر لە داهاتوودا، بە چەشنێك، دواتر رێگەی خۆشکرد تاکو جێنشینەکانی کەمبووجییە بەرەو ئەورووپا بڕۆن و هەڵکوتنە سەر هەرێمی خاکی ئەورووپا.

کەمبووجییە لە ساڵی **٥٢٦**ی پێش زایین ماوەیەك بەر لە هێرشکردنە سەر میسر کارێکی ناشایستی ئەنجام دا، کە بە یەکێك لە کارە نەشیاوەکانی دادەنرێت. کەمبووجییە بە هۆی ئەم کردارە لە رووی ستەمکاری و توندوتیژییەوە بەناوبانگ بوو. برایەکی هەبوو بەناوی " **بەردیا**" کە یۆنانییەکان " **ئێسمێردیس**" یان پێدەگووت. کورووش ئێسمێردیسی خۆش دەویست و لەناو خانەدانان و کۆمەڵانی خەڵکی ئاسایی لە کەمبووجییە خۆشەویستتر بوو. کورووش پێش ئەوەی بمرێ رایگەیاند: کە بەردیا فەرمانڕەوای ساتراپیەکانی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری و کەمبووجییەش فەرمانڕەوای ساتراپیەکانی رۆژئاوایە. کەمبووجییە دەترسا، نەوەك دوای رۆیشتنی بەرەو میسر براکەی شۆڕشی بەسەر دابکات و سنووری رۆژئاوای ئیمپراتۆریش داگیر بکات. لەبەر ئەوە بەدزی دەیکوژێت. **هیرۆدۆت** لەم بارەوە دەڵێت:

*"دوای رۆیشتنی براکەی بۆ پارس، شەوێك کەمبووجییە لە خەودا بینی لە ئێرانەوە نێردراوێك هاتووە و هەواڵی لەسەر تەخت دانیشتنی ئێسمێردیس رادەگەیێنێت. سەرەتا زۆر پەریشان بوو و بەم جۆرە خەونەکەی شیکردەوە، کە براکەی دەیەوێ لەناوی ببات و لە شوێنی دابنیشێ. کەمبووجییە " پرێگزاسپێس* ***Prexaspes*** *" ی راسپارد تاکو براکەی لەناو بەرێت. ئەم پرێگزاسێسە کە باوەڕپێکراوی کەمبووجییە بوو رۆیشتە پارس و فرمانەکانی جێبەجێ کرد. هەندێ پێیان وایە، لە نێچیرگادا کوشتی و هەندێکی تر دەڵێن بە پیلان و قسەی خۆش ئەوی بردە لای کەنداوی فارس و لەوێدا خنکاندی[٢٩].*



**نیگارکێشێکی هاوچەرخی ئێمە وێنەیەکی خەیاڵی کەمبووجییەی ئیمپراتۆری ئێرانی لەکاتی کوشتنی گای پیرۆز، ئەفراندوە. ناوی ئەم گایە ئاپیس بوو و لە میسر بە گای پیرۆز ناوبراوبووە. پێدەچێت ئەم چیرۆکە لە رۆژگارەکانی پاش کەمبووجییە دروستکرابێ، تاکو کەسێتی ئەم ئیمپراتۆرە خراپ بکات.**

کەمبووجییە لە ساڵی **٥٢٥**ی پێش زایین بە دڵنیاییەوە لەوەی، کە تەنیا رکابەر و رەقیبی بەتوانای خۆی لەناوبردووە، لە بەرگی سەرکردەی سوپایەکی گەورە گەیشتە میسر. **"ئاماسیس** Amasis"ی فیرعەونی میسریەکان کە فەرماندەیەکی لێهاتووی جەنگی بوو، تازە کۆچی دوایی کردبوو و جێنشینە گەنج و کەم ئەزموونەکەی بەناوی " **پسامێتیخی سێیەم** PsametikIII " (یان **پسامیتکووس** Psametichos) دەبوایە رووبەڕووی هێرشی ئێرانییەکان بێتەوە. هەردوو سوپاکە لە نزیك **پێلووزیووم** Pelusium کە دەکەوێتە کەناری رۆژهەڵاتی دەشتی نیل لە لێواری دەریا رووبەڕووی یەکتری بوونەوە. ئێرانیانی جەنگاوەر بەسەر میسریەکاندا سەرکەوتن و فیرعەونی گەنج بە ناچاری گیانی خۆی هەڵگرت و بۆی دەرچوو.



سەرکەوتنی کەمبووجییە ئەوها بوو، کە سەرتاسەری وڵات بێ هیچ رووبەڕووبوونەوەیەکی تری توندوتیژانە خۆی بە دەستەوە دا. بەم جۆرە دوایین زنجیرەی دێرینی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش کەوتە ژێردەستی ئێرانییەکانەوە.

کەمبووجییە نزیکەی سێ ساڵ لە میسر ماوە و ناوەڕۆکی کردارەکانی لەم ماوەیەدا تەواو روون و ئاشکرا نین. رووداوی دڵتەزێن و تۆقێنەری زۆر لەناو بەرهەمی هیرۆدۆت و نووسەرانی تری رۆژگاری دێرین لە بابەت رەفتارە توندوتیژەکانی کەمبووجییە و بێڕێزیەکانی بەرچاو دەکەون، کە پێدەچێت مەرگی هەزاران کەس لە سەربازانی خۆی لێکەوتەوە. بۆ نموونە دەڵێن کەمبووجییە بەتوندی و توندوتیژانە لەگەڵ جەستەی مۆمیاییکراوی ئاماسیس جووڵاوە. **"گای ئاپیس"** ی کوشت ئەو گایەی کە بۆ میسرییەکان پیرۆز بوو و هەڵیکوتایە سەر وڵاتی **"نۆبیە "** کە دەکەوتە باشووری میسر بێ ئەوەی خۆراکی پێویست بۆ سەربازەکانی دابین بکات. زۆربەی ئەم سەربازانە مردن یان تووشی مرۆڤخۆری بوون.

***بۆچی کەللەی سەری ئێرانییەکان نەرم بوو***

*کاتێك کە **هیرۆدۆت** لە ساڵی ٤٥٠ی پێش زایین چووە میسر، شارەزایان شوێنی جەنگی پۆزیوومیان پیشانی ئەودا. ئەو جەنگەی کە ٧٥ ساڵ پێشتر رووی دابوو. هیرۆدۆت لە کتێبی "مێژووەکان" بینینە سەیر، بەڵام سەرنجڕاکێشەکانی خۆی بەم جۆرە پێشکەش دەکات:*

*"لە شوێنی رووداني جەنگەکە، تاکو ئێستا ئێسکانی سەربازەکان لەو گۆڕە کەوتبوون. ئێسکانی پارسەکان لەلایەك و ئێسکی لەشی میسرییەکانیش لە لایەکی تر... و زانیم کەللەی سەری پارسییەکان نەرم و ناسك بوو بە لێدانی ورکە بەردێك کۆن دەبوو، بەڵام بە پێچەوانەوە، کەللەی سەری میسرییەکان ئەوەندە رەق و توندبوو کە تەنانەت بە لێدانی بەردیش نە دەشکا. پێیان گووتم.. ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە میسرییەکان لە منداڵییەوە سەری خۆیان دەتاشن و لەبەر ئەوە ئێسکی کەللەی سەریان بە هۆی تیشکی رۆژ رەق و توند دەبێت... نەرمی ئێسکی سەری پارسییەکانیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئەوان بەردەوام کڵاو دەکەنە سەریان تاکو سەریان لە تیشکی خۆر بپارێزن و دوور راگرن.*

لەگەڵ ئەوەشدا زانایانی ئەم رۆژگارە ئەگەرچی گشت ئەم چیرۆکانە بەدەستکرد نازانن، بەڵام پێیان وایە، پڕ لە زێدەڕەوی و بێهۆدە گۆیینە. بۆ نموونە لە کاتێکدا کە هێرشی کەمبووجییە بۆ باکووری نۆبیە سەلمێنراوە، بەڵام هۆکاری تەواو و دروستی ئەم هێرشە ئاشکرا نییە. هەروەها

لەگەڵ ئەوەشدا کە تارِادەیەك کەلوپەلی پێویست بۆ ئەم هێرشە لەلایەن کەمبووجییەوە دابین کراوە، ئەو تۆمەتانەی، کە دەدرێتە پاڵ کەمبووجییەوە بە هۆی کردەوە ناعەقڵانییەکانی و دابیننەکردنی پێداویستی سوپاکەی لەکاتی هێرشکردنە سەر میسر بێبایەخ دەبێتەوە. بە پێچەوانەوە کۆمەڵە بەڵگەیەکی سەلمێنراو لەبەر دەست دانە، کە کەمبووجییە فرمانی سزادانی پسامتیخی گەنج و تالانکردنی هەندێ لە پەرستگاکانی میسری دەرکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم رەفتارە دژی رەفتاری نەرم و بە بەزەییانەی کورووش بوو، بەڵام رفتارێك بوو بەزۆری لە رۆژگارە دێرینەکان گشت دەسەڵاتدارە سەرکەوتووەکان بەسەر دوژمنانی خۆیاندا ئەنجامیان دەدا. بێگومان ئەو چیرۆکە نەشیاوانەی هیرۆدۆت دەیان ساڵ دواتر لە کاتی سەفەرکردن بۆ میسر لەبابەت کەمبووجییەوە بیستوویەتی، قسەی ئەو میسریانە بووە، کە وڵاتەکەی خۆیان لە بارودۆخێکی پەست و نالەباردا دەبینی.

## فەرمانڕەوایەتی کەسێکی فریووکار

کەمبووجییە لە میسردا هەرچیەکی کردبێ، لە ساڵی ٥٢٢ی پێش زایین بڕیاری دا بۆ ئێرانی نیشتمانی خۆی بگەڕێتەوە. لە کاتێکدا بڕیاری گەڕانەوەیدا، کە ئاگادارکراوە کەسێك بەناوی **"گیووماتا** Gaumata" لە ئێران شۆڕشی کردووە و لە **ئیکباتان** جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرتووە. گیووماتا (کە یۆنانییەکان **" ئێسمێریسی درۆین"** و ئێرانییەکان **"بەردیای درۆین"** یان پێگووتوە) جاری ئەوەی لێدا، کە بەردیای برای کەمبووجییەیە. بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە ئەویش دەچوو. لەبەر ئەوەی کوشتنی بەردیا بە نهێنی بەرێوەچوو بوو زۆربەی ئێرانییەکان و نەتەوەکانی ژێر دەستی ئیمپراتۆری باوەڕیان پێکرد. **داریووش** لە بەشێکی نووسراوە بەردینی **بێستوون** لە باشووری رۆژئاوای ئێکباتان، بەم جۆرە ئاماژە بە رووداوەکانی ئەم پێشهاتە دەکات:

*کاتێك کە کەمبووجییە بەرەو میسر بەرێکەوت. کۆمەڵانی خەڵکی یاخیبوونەوە. دوای ئەمە لەوڵات دا درۆ زۆر بوو، هەم لە پارس هەم لە ماد هەم لە سەرتاسەری وڵاتەکان... پاشان پیاوێکی مۆغ کە ناوی گیووماتا بوو لە ((پەئیشی یاڤادا)) شۆرشی کرد... کاتێك کە لەوێ سەری هەڵدا چواردە رۆژ لە مانگی ڤی یەخنا [١١ی مارس/ ٢٠ ی ڕەشەمێی ٥٥٢ی پێش زایین] تێپەڕی بوو بەم جۆرە درۆی لەگەڵ خەڵکی کردو گووتی من بەردی [بەردیا] کوڕی کورووش برای کەمبووجییەمە.لە پاش ئەوە خەڵك لە کەمبووجییە هەڵگەڕانەوە و هەم پارس هەم ماد هەم وڵاتانی تر بەرەو پیلی ئەو رۆیشتن. خۆی بە فەرمانڕەوا ناساند.*[٣٠]"



رووداو و پێشهاتەکانی هەفتەو مانگەکانی دواتر لە پشت پەردەی تاریکی ماوەتەوەو هیچ شتێك دیارنییە (لەوانەیە ئەم نادیارییە هۆکاری سیاسی لە پشت بێت). کەمێك پاش هەواڵی شۆڕشی گیووماتا، کەمبووجییە بەشێوەیەکی نادیار و شاراوە مرد. هەندێ دەڵێن بە هۆی ئەو برینەی، کە بەرێکەوت بە هۆی چەقۆیەك لێی کەوتەوە تووشی نەخۆشی قانقاریا بوو. هەندێکیش پێیان وایە، کەمبووجییە باری دەروونی زۆر تەواو نەبوو و دوابەدوای بیستنی هەواڵی ئیکباتان خۆی کوشت. لە پاش مەرگی فەرمانڕەوا گیووماتا توانی نزیکەی حەوت مانگ (لە رەشەمێوە تاکو رەزبەری ساڵی ٥٢٢ی پێش زایین) فەرمانڕەوایەتی بکات. پاشان چەند رەسەنزادەو بەگزادەیەکی بەهێزی پارسی پیلانێکیان دارِشت و ئەویان کوشت. لەناو خۆیاندا داریووشیان بۆ فەرمانڕەوایەتی هەڵبژارد. داریووش لە خوێنی لقێکی تری خانەدانی هەخامەنیشی بوو و بەم جۆرە فەرمانڕەوایەتییەکەی شێوازێکی قانوونی و ڕەوایانەی بەخۆیەوە گرت. داریووش لە نووسراوە بەردینەکەی بێستوون بەم جۆرە بە سەرخۆی دا هەڵدەڵێت:

"دە رۆژ لە مانگی ((باگە یادیش)) **[**٢٩ی سێبتامبەر /٧ ی ڕەزبەری ساڵی ٥٥٢ی پێش زایین**]** تێپەڕیبوو. ئەوسا من بە یارمەتی چەند کەسێك گیووماتای مۆغ و ئەو کەسانەم کوشت کە لە ریزی باشترین پیاوان و ڕاوێژکارانی بوون. لەناو کۆشکی ((سیکەیە ڤەوەتیش)) کوشتم، ئەو شوێنەی کە دەکەوێتە ((**نی سایە**))ی ماد. فەرمانڕەوایەتیم لێستاندەوە. بە خواست و ویستی ئاهوورەمەزدا من بوومە فەرمانڕەوا. ئاهوورەمەزدا فەرمانڕەوایەتی پێشکەشی من کرد[٣١]".

بۆچی داریووش و یاوەرانی ئەم فەرمانڕەوایەیان لادا؟ خودی داریووش دواتر دەڵێت گیووماتا فەرمانرەوایەکی ستەمکار بووە، کۆمەڵە خەڵکێکی بێ تاوانی کوشتووەو "خەڵکی لە ستەمکاری و دڵڕەقی ئەو تۆقابوون.[٣٢]" لەلایەکی ترەوە کۆمەڵە بەڵگەیەك لەبەر دەست دانە، کە پیشان دەدەن گیووماتا کەسێکی ئیماندار و تێکۆشەرێکی ماندوونەناس بووە، کە هەوڵی چاکسازی کۆمەڵایەتی و ئاوەدانکرنەوەی کۆمەڵگای داوە، و ویستوویەتی بە خێرایی کۆمەڵە گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی بەدی بێنێت. ئەمەش هۆشدارییەك بووە بۆ بەگزادە توندڕەوکان، کەخوازیاری مانەوەو بەردەوامبوونی ئەم بارودۆخە بوون، هەرچییەك بێ ئەوان ویستوویانە بۆ لابردنی ئەو لە دەسەڵات بەڵگەیەکیان لەبەر دەست دابێ.

بۆچوونێکی گرنگ ئەوەیە ئەو پیاوەی بەگزادەکان کوشتوویانە، درۆزن نەبووە. بەڵکوو بەڕاستی خودی بەردیا بووە. بە پێی ئەم بۆچوونە کەمبووجییە بەردیای نەکوشتبوو و بەردیا بە یارمەتی و پشتیوانی داریووش و بەگزادەکانی تر کاتێك کە کەمبووجییە لە میسر بوو، تاج و

تەختی فەرمانڕەوایەتی داگیرکردبوو. کاتێك بەردیا دێتەسەرکار کۆمەڵێك چاکسازی دەکات و ئەوها بەخێرایی کاردەکات، کە ئەو بەگزادەو رەسەنزادانەی لە سەرەتا پشتیان دەگرت بڕیاری لەناوبردن و کوشتنیان دا. دوایی بۆ باش پیشاندانی کارەکەیان رادەگەینن کە کەسێکی داگیرکەرو یاخییەو لەبەر ئەوە ئەوان ناچاربوونە فەرمانڕەوایەتی ئیمپراتۆرییەتی ئێران لە چەنگی یاخیبووەکی فریووکار دەربێنن. ئەگەر ئەمە راستیەکە بێت، روونکردنەوەیەکە سەبارەت بە جاڕلێدانەکانی دواتری داریووش لە بابەت کارە توندوتیژ و بێ دادپەروەرییەکانی بەردیا، کە لەگەڵ ناوداری و بەبەزەییبوون و دڵگەورەیی ئەودا سازگار نییە. هەروەها نهێنی مەرگی لەناکاو و شاراوەی کەمبووجییە کەمێك دوای بە دەستەوەگرتنی دەسەڵات لەلایەن بەردیای یاخییەوە شاراوەیە. لەوانەیە کەمبووجییە بەدەست ئەفسەرانی خۆی کوژرابێت، ئەو ئەفسەرانەی کە دەسەڵاتی بەردیایان لە دەسەڵاتی ئەو پێ باشتر بووە. ئەگەر بەم شێوە بێت ئیتر ئەو گوزارشانەی لە بابەت مەرگی ئەوەوە راگەیێنراون ساختەو دەستکردن و دواتر بۆ هاوتەریبکردن لەگەڵ چیرۆکی داگیرکردنی تاج وتەخت بە دەست بەردیا دروست کراون. لەوانەیە هەرگیز راستییەکانی ئەم رووداوە ئاشکرا نەبێت، ئەو شتەی، کە دیارە ئەوەیە داریووش لە ساڵی ٥٢٢ی پێش زایین بۆتە فەرمانڕەوای ئێران و شکۆو گەورەیی ئەم ئیمپراتۆرییەتەی گەیاندۆتە لوتکە.

## دووبارە یەکگرتنەوەو رێکخستنەوەی سەر لەنوێی ئیمپراتۆری

داریووش بەر لەوەی بتوانێ پلانەکانی خۆی لە بابەت ئیمپراتۆرییەوە بخاتە قۆناغی جێبەجێکردن، دەبوایە ئیمپراتۆری لە مەترسی لەناوچوون و رووخان دەرباز بکات. هەرکە هەواڵی کوشتنی بەردیا (یان هەرکەسێك کە بووبێ) بڵاوبۆوە زۆربەی ئەو ساتراپیانەی، کە دەیانوویست لە ژێر فرمانی دەسەڵاتی ناوەندی دەرباز بن دەستیان بە شۆڕش و یاخیبوونەوە کرد. **سێرپێرسی سایکێس** Sirpercy sykes لەکتێبی **"مێژووی ئێران"**دا دەڵێت:

*ساتراپییەکانی ویلایەتە دوورەکان پێیان وابوو چارەنووسی ئیمپراتۆرییەتی پارس وەکو ئیمپراتۆرییەتی مادی لێ دێ، بۆیە دەیانوویست ئیمپراتۆرییەکە لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن. جا بۆیە دەبوایە داریووش ئەم ویلایەتانە بگرێتەوە یان دووبارە بیانخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی و ئەمەش لە کاتێکدابوو، تەنیا سوپای سەربازی و چەند ویلایەتێك پێیی وەفادار مابوونەوە. ویلایەتەکانی عیلام و بابل هەرزوو یاخیبوونەوە... لەم ناوەدا ویلایەتی ماد، کە دەیوویست خۆی لە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوای نوێ دەرباز بکات بە سەرۆکایەتی کەسێك بەناوی "فرائۆرتیش **Phraortes**" کە دەیگووت لە نەوەکانی کیاکسار [هوەخشتەرە]یە، یاخیبۆوە تاکو شکۆو گەورەیی رابردووی خۆی بەدەست بێنێتەوە... ویلایەتی پارس (فارس)یش یاخیبۆوە و کەسێکی تر بەناوی "ڤاهیەز داتا **Vahyaz data**" خۆی بە بەردیا دانا*[٣٣].

**نەخشە هەڵکەنراوی بێستوون**

ئەم بەشە لە کتێبی " **مێژووی ئیمپراتۆری ئێران** " نووسینی **ئا.ت.ئۆمستێد**ەوە وەرگیراوە.

" پەیکەری داریووش کە نموونەی سیمای راستەقینەی ئاریایی نەژادێکی رەسەنە، لەسەر تەختە بەرد نەخشێنراوە: نێوچاوانی گەش و لووتێکی راست، باڵایەکی ١٧٥ سانتی مەتری. تاجی جەنگاوەری لەسەر ناوە، و... بەشریتێکی زێڕین و گەوهەرو گوڵی میخەك رازاوەتەوە. زوڵفی زۆر بەجوانی لوول دراوەو سمێڵی زۆر بەرێکی بەرەو سەرەوە راکشاوە... ریشی بەشێوەیەکی چوارگۆشە لە چوار ڕیز لوول دراوەو بەشێوەی پاشایانی پێشینی ئاشوور رێکخراوە. تەنپۆشێکی درێژ لەشی قەڵەوی دادەپۆشێت... و لە خوارەوە لە هەردوو لاوە هەڵقەڵێشاوەو بەم جۆرە شلوارەکەی لە هەردوو لاوە دەبینرێت و پێڵاوی قەیتانداری لە پێ دایە. لە دەستی چەپی فەرمانڕەوا کەوانێك بەرچاو دەکەوێت و دەستی راستی بە هێمای پەرستنی ئاهوورامەزدا بەرزکردۆتەوە... گیووماتی بەختڕەش کەوتۆتە ژێر پێی چەپی و بە هێمای تکاو پاڕانەوە دەستی خۆی بەرزکردۆتەوە. یاخیبووانی ژێرکەوتوو لە بەرامبەر پاشا راوەستاون، کە بە پەتکێك ملیان لێك بەستراوەتەوەو دەستیان لە پشتەوە بەستراوەتەوە."



**نەخشە هەڵکەنراوی بێستوون کە سەرکەوتنی داریووشی یەکەمی بەسەر یاخیبووەکان بەوێنا دەکێشێت.**

**گیۆماتای درۆزن کەوتۆتە ژێر پێی ئیمپراتۆر**

ئەگەر یاخیبووەکان پێیان وابوو داریووش فەرمانڕەوایەکی بێ توانا و بێ دەسەڵاتەو ناتوانێ ڕووبەڕوویان ببێتەوە، هەڵە بوون. داریووش بە تاکتیکێکی بەهێزو توانابییەکی بێکۆتایی و بڕیاری حەکیمانە لە ماوەی کەمتر لە ساڵێك یەك بەدوای یەك ئەمانەی ملکەچکردەوە. سەرەتا بۆ وەدەستهێنانی سەروەری فەرمانڕەوایەتی ئێران، شێوەیەکی هۆشداری پێدان و وشك وتوند و تیژانە، زۆر بەتوندی فرائۆرتیشی مادی سزادا، تاکو ببێتە پەندێك بۆ ئەو کەسانەی لە داهاتوو هەوای شۆڕش و یاخیبوونیان دەکەوێتە سەر. ئەو پیاوە بەخترەشە سەرەتا لووت، گوێ، زمان و چاوەکانی خۆی لە دەست دا پاشان بەزیندوویی کەوڵیان کردو لە دەروازەی ئێکباتان هەڵیانواسی، تاکو هەموو ببینن. شێوازێکی تری داریووش بۆ پیشاندانی هێزو تواناکانی، نووسینی بیرەوەری سەرکەوتنەکانی لەسەر بەرد بوو: لە نەخشە هەڵکەنراوی بێستوون کە لە مانگەکانی دواتر نەخشێنرا، فەرمانڕەوا لە کاتێکدا پیشاندراوە، کە لە بەرامبەر نۆ سەرکردەی یاخیبووی بەدیلگیراو کە بە پەتك لێك بەستراون، ڕاوەستاوە.

ئەرکەکەی تری داریووش ڕێکخستنەوەی دووبارەی ئیمپراتۆرییەتێك بوو، کە لێی نەگەڕا تووشی رووخان بێت. سنووری ئیمپراتۆری خۆی بەسەر بیست ساتراپی دابەش کرد و وەکو کورووش فرمانی دا تاکو دەبیران و راوێژکارانی ساتراپییەکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ بارودۆخی ناوچەکەی پێ ڕابگەینن. بەڵام داریووش کە لە بەدەسەڵاتبوونی ساتراپییەکان ئەزموونێکی نوێی وەرگرتبوو، بە شێوەیەکی گشتی دەسەڵاتی سەربازی لێستاندنەوە. **بائووسانی دەڵێت:**

*هێزی سەربازی هەرکام لە ساتراپییەکان لە ژێر سەرۆکایەتییەکی تەواو جیا لە ساتراپی دابوو و بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە لایەن فەرمانڕەواوە سەرۆکایەتی دەکرا. ئەم شێوازە داهێنراوە کە هەرکام لە بەرپرسانی سیاسی و سەربازی بە شێوەیەکی جیاو راستەوخۆ لە بەرامبەر فەرمانڕەوا بەرپرسیار بوون، دەبووە هۆی ئەوە فەرمانڕەوا بە سەریاندا زاڵبێت. فەرمانڕەوا لە رێگەی چاودێرانی تایبەتی خۆی کە ((چاو و گوێی)) ئیمپراتۆریان پێدەگووترا. ئەم کارانەی دەکرد. ئەم چاودێرانە ساتراپییەکانیان بەسەر دەکردەوە و ئاگایان لەوەبوو شۆرشێك لەوێدا دروست نەبێ و یان ساتراپی لە فرمانەکانی پاشا دەرنەچێت. تایبەتمەندییەکی تری داهێنەرانە ئەوە بوو، کە ژمارەی سەرکردە سەربازییەکان لەگەڵ ژمارەی ساتراپییەکان یەکسان نەبوو، بە چەشنێك کە هەرکام لە سەرکردە سەربازییەکان، بەڕێوەبردنی کاروباری سەربازی و لەشکری چواریان پێنج ساتراپیان بە ئەستۆ بوو[٣٤].*





**داریووشی یەکەم کە لە ٥٢٢ یان ٥٢١ ی پێش زایین دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، راوەستاوە و خزمەتکارەکانی سەیوانێکیان لە سەر سەری راگرتووە، لەکاتێکدا کە ئاهوورامەزدا لە لای سەرەوەی وێنەی ئیمپراتۆر بەرچاو دەکەوێت.**

هەروەها داریووش لەناو ساتراپییەکان شێوازێکی نوێی لە سیستەمی باج داهێنا. بەر لە چاکسازییەکانی، هەرکام لە ویلایەتەکان بە شێوەی خولی ساڵانە ((دیاری)) لە جۆری ئاڵتوون و کەلوپەلە بەنرخەکانی تریان پێشکەش بە دەسەڵات دەکرد. بەڵام هیچ بودجە یان رادەیەکی دیاریکراو بۆ ساتراپییەکان دەستنیشان نەکرابوو، و ساتراپییەکان بەزۆری ئەوەندەی کە

دەیانگووت توانیومانە کۆبکەینەوە پێشکەشی پاشایان دەکرد. داریووش نرخێکی ستاندەری سالانەی بۆ هەرکام لە ویلایەتەکان دەستنیشان کردو فرمانی دا ویلایەتە هەبوونەکانی وەکو میسرو بابل زۆرتر بدەن. ئەم سیستەمە بارانی سەروەت و سامانی باراندە ناو خەزانەی دەسەلاتی ناوەندییەوە.(٣٥)

یەکسانکردن و ستاندەرکردنی سیستەمی باج بە داهێنانی دراڤ و لێدانی سکە هەموارتر کرا. دروستکردنی دراڤی لە لیدیاییەکان فێربوو (بەرلەوە پارەی ئێران بریتی بوو لە ئالتوونی عەیار تەواو و کانزاو کەلوپەلەکانی تری وەکو دانەوێلەو مانگاو کۆیلە). دراڤە زێڕەکانی داریووش ((**دریك**)) یان پێدەگووترا، کە یان بە هۆی ناوی ئەوەوە ئەم ناوەی بۆ دانرابوو یان لە وشەی ((**زریك**)) کە لە فارسی دا بەواتای زێڕ و ئالتوون دێت، وەرگیراوە. بەکاربردنی ئەم دراڤانە وەکو پارەی رەسمی دەوڵەت یارمەتیدەرێك بوو بۆ بەرفراوانکردنی ئالوگۆڕینە بازرگانییەکان چ لە ناوەوەی ساتراپییەکان و چ لەگەڵ نەتەوە بیانییەکانی دەرەوەی ولات.



**لەم هەڵکەنراوە کە لە وێرانەکانی تەختی جەمشید دۆزراوەتەوە، کاربەدەستەکانی ماد لەکاتی رێزگرتن لە داریووش (لەسەر تەخت دانیشتوو) پیشاندراون. داریووش ویلایەتەکانی سنووری ئیمپراتۆرییەت و سیستەمی باج وەرگرتنی بە شێوەیەکی تازە رێکخست.**



## فەرمانڕەوایەکی داهێنەر و کارزان

داریووش لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا کۆمەڵە کارێکی تری ئەنجامدا، کە وەکو دروستکردنی دراڤ، بووە هۆی بەهێزکردنەوەو رێکخستنەوەی سیستەمی نوێی ئیمپراتۆرییە بەرفراوانەکەی. ئەم هەولانەی پیشاندەری توانا بێسنوورەکانی وەکو بەڕێوەبەرو فەرمانڕەوایەکی داهێنەر و کارزان بوو. بۆ نموونە دەیوویست سەرتاسەری ویلایەتە نزیك و دوورەکانی ئیمپراتۆرییەتەکەی بە هۆی رێگەوبانی ئامن پێکەوە بلکێنێت. ئەم کارە هەم دەسەلاتی ناوەندی بەهێزتر دەکردو هەمیش پەیوەندی نێوان ویلایەتە دوورەکانی باش دەکرد. ئەم پلانە دروستکردنی رێگاوبانی زۆری لێکەوتەوە، کە زۆر بە باشی پاسەوانی و چاودێری دەکران. بە هۆی ئەم رێگایانەوە نێردراو و سوپاکانی داریووش دەیانتوانی خێراتر هاتووچۆ بکەن. جگە لەمەش ئەم رێگاوبانانە گواستنەوەی کەلوپەلی بازرگانی لە ویلایەتێکەوە بۆ ویلایەتێکی تریان ئاسانتر دەکرد. بەناوبانگترین بەشی ئەم جادەیە کە ((**جادەی فەرمانڕەوایی**)) پێدەگووترێ، لە لایەن داریووشەوە لە نێوان شووش و سارد درووستکراوە، ٢٥٠٠ کیلۆمەترە. **هیرۆدۆت** کە خۆی بەم جادەیەدا تێپەڕیبوو، بەم جۆرە لێی دەدوێت:

*ناوە ناوە لەسەر جادە وێستگە و مێوانخانەی گەورە دروستکراوە، جادەکە زۆر ئامنە و لەناوچە ئاوەدانەکان دوورناکەوێت. لە لیدیاو فریقیا [لە ئاسیای بچووك] لەسەر یەك رێگای ٥٠٠ کیلۆمەتری ٢٠ وێستگە دانراوە... ژمارەی سەرجەم وێستگەو چاپارخانەکانی سەر جادە لە ساردەوە تاکو شووش دەگاتە ١١١ دانە... مرۆڤێك بە تێپەڕاندنی نزیکەی ١٥٠ فۆرلنگ [٣٠ کیلۆمەتر] لە رۆژێکدا دەتوانێ لە ماوەی ٩٠ رۆژ کۆتایی بەگەشتەکەی بێنێ(٣٦).*

نێردراوانی ئیمپراتۆری [هەوالگەیێن]ی داریووش کۆمەڵە سوارچاکێك بوون، کە بەردەوام لە هەرکام لە وێستگەکان ئەسپی خۆیان دەگۆڕی. ((لەسەر پشتی ئەسپ دەنووستن)) و تەنیا لەماوەی ١٥ رۆژدا ئەم رێگایەیان دەبڕی. جادەیەکی تر وەکو جادەی فەرمانڕەوایی لە ئیکباتانەوە بەرەو باکووری رۆژهەلات و بەرەو باختەر [باکتریا] کێشرابوو.

**پاشماوەکانی کۆشك لە شووش**

**جۆن کێرتیس** John Curtis لە کتێبی **"ئێرانی کۆن"** دا باسی ئەو بینا گەورەو رازاوانە دەکات، کە داریووش لە شاری شووش دروستی کردوونە.

"یەکێك لە هۆکارەکانی گرینگبوونی شاری شووش ئەو بینایانەیە، کە داریووش لەوێدا دروستی کردبوون. لە هەڵکۆڵینە شوێنەوارناسییەکانی ئەم ناوچەیە سەکۆی رووبەر فراوانی زۆر دۆزراونەتەوە. شکۆدارترین و رازاوەترینیان کۆشکی ئاپادانا یان هۆڵی مەیخواری و کۆشکەکانی دەورووبەریەتی کە کۆمەڵە ژوورێك لە دەور تا دەوری حەسارێکی گەورە بە شێوەی بابلی تێدا بەرچاو دەکەوێت... نەخشەی بینای ئاپادانا... بریتییە لە هۆڵێکی دینگە ((ئەستووندار)) چوار گۆشە، کە چەند تاوەرێك لە چوار کوچکەی بینا دەبینرێت، لە سێگۆشەی ئەم هۆڵە چەند هەیوانێك لە نێوان بورج و تاوەرەکان دروستکراوە. کۆمەڵە ستوونێکی بەردی زۆر جوان بنمێچەکەیان راگرتووە و لەسەر ئەستوونەکان دوو کەڵەگا پشت بە پشتی یەکتر دانیشتوونە... لەو کۆشکەی کە داریووش لە تەك ئاپادانا دروستی کردووە، تابلۆی لە خشت دروستکراوی رەنگاوڕەنگ، کە پێدەچێت دیوارەکانی حەساری رازانبێتەوە بەدی دەکرێن. یەکێکیان جووتە شێرێکی باڵدارمان پیشان دەدات، کە شێوەی سەریان کەللەی سەری ئادەمیزادەو لە خوارەوەی ریزە نەخش و نیگارێکی ئەفسانەیی بەرچاو دەکەون و لەوی تریان ریزی پاسەوانانی ئیمپراتۆری کە **((لەشکری تایبەت))** یان **((لیوای نەمر))**یان پێدەگووترێ نەخشێنراوە.



**ئەو پەیژە گەورەیەی کە بە گۆشەی رۆژهەڵاتی کۆشکی ئاپاداناوە دەلکا ( هۆڵی بارێکی گەورە کە کۆمەڵە دینگەیەکی بەرز بنمێچەکەیان رادەگرت) و لە تەختی جەمشید دا دەبینرێت.**





**وێنەی پاشماوەکانی دەروازەیەکی کۆشکی تەختی جەمشید. پەیکەری دوو کەڵەگای گەورە لە شێوەی ئاشووری، کە کەللەی سەریان کەللەی سەری ئادەمیزادە، بەرچاو دەکەون.**

کارە گرنگەکانی تری داریووش بریتی بوون لە دروستکردنی کاناڵەکانی ئاو و ئاوەڕۆکان و کۆشکەکانی تر. نزیکەی **٢٥٠٠** ساڵ بەر لە دروستکردنی کەناڵ **((ئاودڕگە))** ی **سوییز**، داریووش کۆتایی بە دروستکردنی ئەو کەناڵە هێنا (کە میسریەکان دەستیان بەدروستکردنی کردبوو) ئەم کەناڵە دوو سەد کیلۆمەتر نێوان رووباری نیل تاکو دەریای سووری دەگرتەوە. بەم

چەشنە دەریای ناوەڕاستی بە دەریای سوور (و دەریای عەمان و کەنداوی فارس)ەوە لکاند. هەروەها کۆمەڵە کۆشکێکی فەرمانڕەوایی گەورەی لە شووش دروستکردو دەستی بە دامەزراندنی بینای کۆمەڵگای کۆشکەکانی **تەختی جەمشید** (لە باشووری رۆژئاوای پاسارگادی ویلایەتی فارس) کرد، کە دواتر بە دەستی جێنشینەکانی تەواو کرا.

هەروەها داریووش سەرنجی بەهێزکردنی سوپاو بەرفراوانکردنی سنووری ئیمپراتۆری دەدا. تاکو رۆژگاری ئەو زۆربەی سەربازانی سوپای ئێران لە سەربازانی ناوچەی پارس و ویلایەتەکانی تر دابین دەکران. گرنگترین کاری سەربازی داریووش ئەوەبوو، کە جگە لە چەکدارکردنی سەربازانی پێ ڕاگەیشتووی خۆماڵی، سەربازی بیانیشی بەکرێ دەگرت. سەرگرتنی ئەم پلانە لە رێگەی ئەو باج و کاروبارە بازرگانییانەوە بوو، کە لە وڵاتدا باوکرابوو.

داریووش بۆ ئامادە راگرتنی سوپاکەی و هەروەها بەرفراوانکردن و بەرەوپێشبردنی دەسەڵات و دەوری کاریگەری خۆی لە جیهانی ئەوسا، لە ساڵی **٥١٩**ی پێش زایین بەسەر سەکاکانی دادا. **سەکاکان** نەتەوەیەك بوون کە لە ناوچە دوور و ناهەموارەکانی باکووری رۆژئاوای هیند دەژیان. ئەم ناوچەیە زۆر زوو گیرا و بووە یەکێك لە ساتراپییە نوێکانی ئیمپراتۆری. بەڵام گرنگی ناردنی سوپا لەلایەن داریووشەوە بۆ وڵاتانی رۆژهەڵات پشتگوێ خرا، چونکە بە خێرایی بەرەو رۆژئاوا گەڕاوە تاکو ئێسکێتەکان واتا نەتەوە نیمچە شارنشینەکانی هەرێمی رۆژئاوای دەریای ڕەش بخاتە ژێر دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی خۆی. ئەم هێرشکردنە بۆ داریووش و جێنشینەکانی چارەنووسی ئایندەی بەدیار دەخست، چونکە یەکەمین هێرشی ئێران بەرەو ئەورووپا بوو. کیشوەری ئەورووپا وەکو قەڵایەك وابوو کە **دەوڵەت-شارە** بچووکە و چیرە درێژو خۆڕاگرە یۆنانییەکان وەکو پاسەوانەکانی ئەم قەڵایە وابوون.

## (٤)

## فەرمانڕەوایان، خەڵکی ئاسایی و کۆیلەکان ژیان لە ئێرانی رۆژگاری دێرین

ئیمپراتۆرییەتی ئێران لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی داریووشی یەکەم، گەیشتە ئەوپەڕی گەورەیی و شکۆی سیاسی و سەربازی. تایبەتمەندییەکانی ئەم شکۆو گەورەییە تاکو سەردەمی لەناوچوونی ئەم ئیمپراتۆرییەتە لە سەدەی چوارەمی پێش زاین بەردەوام بوو. رێوڕەسم و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و ئاینییەکەشی لە بنەڕەتدا بۆ ماوەی چەندین دەیەی نەپچڕاو وەك خۆی مایەوە، بە چەشنێك دەتوانین ژیانی رۆژانەی کۆمەڵانی خەڵکی رۆژگاری ئەو بە نموونەی گشتی کولتووری ئێران دابنێین. زانایانی ئەم رۆژگارە بەردەوام رووبەڕووی کەرەستەکانی ئەم کولتوورە بوونەتەوە کە بە گشتی ئێرانینە، بەڵام ئاوێتەی کولتوورەکانی ئاشووری، لیدیایی، مادی، بابلی و کولتوری تر بووە. ئیمپراتۆرییەتی ئێران بەر لە هەموو شتێك پێکهاتبوو لە کۆمەڵە






هەرێم و نەتەوەیەکی جیاجیا کە هەرکامیان زمان، داب و نەریت و ئاینی تایبەت بەخۆیانیان هەبوو. ئەگەرچی فەرمانڕەوایانی ئێران بەزۆری رەسەنزادەو بەگزادە ئێرانییەکانیان دەکردە بەرپرس و گەورەی ساتراپی و سوپاکان و لەرێگەی ئەم کەسانەوە راگرایەتی ئیمپراتۆرییەتەکەیان دەهاتە دی، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی رێگە بە گەورە پیاوانی نائێرانی خەڵکی رەسەنی ناوچەکە دەدرا، تاکو خاوەن پلەوپایەو ژیانی تایبەت بەخۆیان بن. بەم پێیە لە راستیدا دوو ئێران هەبوو: یەکێك **ئیمپراتۆرییەتی گەورە** کە بە گشتی لە کۆمەڵە کولتوورێکی نائێرانی پێکهاتبوو و ئەوی تریان ناوەندو دڵی ئیمپراتۆری، واتا **پارس** بوو کە ناوچەیەکی جوگرافیایی بچووك بوو و دەکەوتە رۆژئاوای ئێران. لە رۆژگاری ژیانی داریووش و جێنشینەکانی ئەم ناوەندە تەنیا سنووری خاکی فارس و کۆشکەکانی پاسارگاد و تەختی جەمشیدی نەدەگرتەوە، بەڵکو بەرزاییەکانی دەوروپشتی ئێکباتان و دەشتە بە پیتەکانی دەوروپشتی شووشیشی دەگرتەوە.

ئەو بەڵگە شوێنەوارناسییانەی کە لەم ناوچەیە دەست کەوتوونە پیشاندەری هەبوونی کۆمەڵگایەکە، کە تێیدا کولتووره جیاجیاکانی سەرەتایی میزۆپۆتامیاو گەلانی ئێرانی تێکهەڵکێش کرابوون. لەبەر ئەوەیە ئێرانییەکان وەکو رۆمییەکانی دوایی، بە ئاسانی بیروباوەڕو داب و نەریتی گەلانی تریان وەردەگرت. هیرۆدۆت دەڵێت: "هیچ نەژادێك بە رادەی نەژادی ئێرانی ئامادەیی وەرگرتنی شێوازەکانی بیانی نییە. بۆ نموونە جلوبەرگی مادەکانیان دەکردە بەر، چونکە پێیان وایە، لە جلوبەرگی خۆیان جوانترە و سەربازەکانیان زرەی قۆڵکورتی میسرییەکانیان دەکردە بەر"[٣٧] نموونەی تری وەکو پەروەردەکردنی ئەسپ لە بەرزاییەکانی ئێران و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات کە تایبەت بە ئێرانییە خێوەتنشینە هەوەڵێینەکان بووە، لەئارادبووە. لە ناوچە هەموارەکانی وڵاتی ئێران بە شێوەی بابلییە کۆنەکان زەویان دەکێڵا و هەروەها شێوەو بیری سەربازی و سیاسی ئاشوورییەکانیان وەرگرتبوو.



**ئێرانییەکی سەربە توێژی سەرەوەی کۆمەڵگا بە جلوبەرگی رازاوە و تایبەتی خۆی، لەکاتێکدا بەرچاو دەکەوێت کە دوو جەنگاوەری خانەدان بە کڵاوی لبادی "تیارای" لەسەر لە تەکی وەستاون.**

بە داخەوە سەرچاوەی پێویست لە بابەت ناوەندی پارس بۆ روونکردنەوەی بارودۆخی کۆمەڵگای ئێرانی لەبەر دەست دانییە. زۆربەی گوزارەشە دەستکەوتووەکانی ئێرانی ژمارەیەك زانیاری سنووردار سەبارەت بە چالاکییەکانی کولتووری و ژیانی رۆژانەی ئەوانمان بە دەستەوە دەدات. ئەو زانیارییانەش بەزۆری لە بابەت ئەندامەکانی خانەوادەی پاشایەتی و ئەندامەکانی دیوانی و فەرمانڕەوایی و چین و توێژەکانی سەرەوەی کۆمەڵگایە. سەرچاوە یۆنانییەکان وەکو



**هیرۆدۆت** و **گەزنەفۆن** زانیارییەکی زۆرترمان پێڕادەگەیێنن، بەڵام ئەوانیش وەکو مێژوونووسەکانی تری رۆژگاری دێرین باسی رەفتارو کردار و داب و نەریتی خەڵکی هەبوون و دەسەڵاتدارمان بۆ دەکەن و کەمتر باسی ژیانی خەڵکی ئاسایی دەکەن. **ئالکساندەر بائۆسانی** دەڵێت:

*کاتێك سەیری مێژووی دێرینی ئاسیا دەکەین... بەردەوام چاومان بە زاراوەی وەکو ((گەلی پارس))، ((مادەکان)) یان ((بابلییەکان)) دەکەوێ و لە راستیدا کۆمەڵە زاراوەیەکن بۆ ناونانی ئەو چەند هەزار کەسەی کە توێژی خاوەن دەسەڵاتی دەوڵەتە ناوادارەکانی پارس، ماد، بابل و ئەوانی تر پێکدێنن. ئێمە تەنیا شارەزای ئایین، زمان، هونەر، فەلسەفەو ئامانجەکانی ئەم چەندین هەزار کەسە نیە*[٣٨].

لە راستیدا سەبارەت بە ژیانی خەڵکی ئاسایی کە دانیشتوانی سەرەکی و زۆرینەی خەڵکی ئێرانییان پێك دێنا، زانیارییەکی ئەوتۆمان لەبەر دەست دانییە و بۆ نموونە ئاشکرا نییە، کە ئایا کۆمەڵانی خەڵکیش هەمان خواوەند یان ئەو خواوەندانەیان دەپەرست کە لەلایەن فەرمانڕەواکانەوە دەپەرستران یان نا. یان ژیانی ژنانی ئاسایی ناو کۆمەڵگاو ئەو هەڵسوکەوتەی کە لەگەڵیان دەکرا، وەکو ئەو رەفتارو هەڵسوکەوتانە بوو کە لەگەڵ ژنە زەنگین و رەسەنزادەکان دەکرا یان جیاواز بوو؟.

## پەیژەی کۆمەڵایەتی

لەبەر ئەوەی زانیارییەکانمان لە بابەت ژیانی زەنگین و ناودارانی ئێران تەواوتر و راسترە، جێگەی خۆیەتی سەرەتا باسی ژیانی چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵگا بکەین و بۆ دەستپێك باشترە لە فەرمانڕەوا و دیوانەکەی دەست پێ بکەین. داریووش و بە قسەی یۆنانییەکان ((پاشا گەورەکان)) ی تر فەرمانڕەوایانێکی خاوەن دەسەڵاتی رەها بوونە کە بە سەرچاوەی قانوون، شکۆو رێزو گەورەیی دادەنران. تەنیا سنوورێك کە بۆ دەسەڵاتی پاشا دادەنرا، ئەوەبوو چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەکرد رەچاوی داب و نەریت و رێورەسمی ئێرانییەکان بکەن و بەر لە بڕیارە گرنگەکان لەگەڵ گەورە پیاوانی ئێران مشتومڕ و راوێژکاری بکات. بەڵام جێگەی سەرسووڕمان نییە، ئەگەر راوێژکاران لە ترسی ئەوەی نەوەك دڵی پاشا بڕەنجێ دژی بۆچوونەکانی راوەستن.

**ڕەفتارێکی پەست و نەشیاو؟**

زۆربەی یۆنانییەکان کە بینەری ڕێورەسمی **"پڕۆسکێنیسایس** Proskenysis" واتا کڕنووشبردن بۆ پاشا بوون، بەکارێکی ناشایستەو پەستیان دانا. **"ئاریان"**ی مێژوونووس لە کتێبی "ئاناباسیس" بەم جۆرە باسی هەست و سۆزی **"کالیستێنێس** Callisthenes" دەکات کە ئەفسەرێکی سوپای **ئەسکەندەر** بوو:لەبیرتان نەچێ ڕێزگرتن لە مرۆڤێك لەگەڵ پەرستنی خواوەند جیاوازە. جیاکردنەوەی ئەم دووانە بەچەند شێوەیەك دەبێت، بۆ نموونە دروستکردنی پەرستگەو دانانی پەیکەرو پێشکەشکردنی خاکی پیرۆز، تایبەت بە خواوەندکانە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕەفتارانە لە بەرامبەر ڕێورەسمی کڕنۆش بردن، گرنگییەکی نییە. کاتێك ئادەمیزادەکان یەکتری دەبینن، ڕووی یەکتری ماچ دەکەن، بەڵام خواوەندێك، کە دوور لە ئێمە لەسەر تەختی پڕ نهێنی خۆی دانیشتووە، نابێ دەستی لێبدرێ. لەبەر ئەوەیە لە بەردەم بارەگای ئەو سەری نەوازش دادەنوێنین... جا بۆیە ئەگەر ئەم جیاوازییە لێك دەرنەکەین تووشی هەڵەو تاوان بووینە. ئێمە نابێ زێدەڕەوی بکەین لە ڕێزگرتن لە ئادەمیزادێك ئەگەر هەرچەندی گەورەو شکۆداریش بێت، یان بەم کارەمان بەرامبەر بە خواوەندەکان بێ ڕێزی بنوێنین... و پلەوپایەیان تاکو پلەی ئادەمیزاد دابەزێنین".

فەرمانڕەوا لە بەردەم گشت کۆمەڵانی خەڵك جلوبەرگێکی مادی سووری دەبەردەکرد. ئەم جلوبەرگە سوورە لەسەردەمە کۆنەکانی فەرمانڕەواییەتی ڕەنگی باوی پاشایەتی بوو، بە تاروپۆی زێڕین لێك دوورابوو. فەرمانڕەوا تاجێکی شکۆداری لەسەر دەکرد، کە بە گەوهەری بریسکەدار ڕازبۆوە. هەروەها جووتە گوارەیەکی جوانی بە گوێیەکانی هەڵدەواسی و لەسەر تەختێکی ڕازاوە دادەنیشت. سەرجەم مرۆڤەکان بە تایبەتی گەورە پیاوان و بەرپرسە گەورەکان کاتێك لێی نزیك دەکەوتنەوە، دەبوایە بەهێمای ڕێزلێنان لەبەردەمی سەر دابنوێنن. ئەم داب و نەریتە لەلایەن یۆنانییەکانەوە (**پڕۆسکێنیسێس**)ی پێگووتراوە. ئەم وەسفەی لە لایەن **گەزنەفۆن** سەبارەت بە شکۆداری و گەورەیی **کورووشی** ئیمپراتۆری ئێران کراوە:

*کاتێك کە دەروازەکانی کۆشك بە تەواوی کرانەوە، لە پێشەوەی هەمووان چوار کەڵەگای تایبەت بە قوربانی بەڕێدا دەڕۆیشتن... دوای ئەم کەڵەگایانە، ئەو پۆلە ئەسپەی کە بۆ خۆر [مێهر، میترا] قوربانی دەکران، بەرچاو دەکەوتن و پاشان ئەو کەژاوە سپییەی کە ئەسپ بەندێکی زێڕینی هەبوو و بە چەپکە گوڵ ڕازابۆوە و تایبەت بە زیووس [ئاهوورەمەزدا] بوو، و دوای ئەمەش کەژاوەیەکی سپی تر، کە تایبەت بە میترا بوو و وەکو کەژاوەکەی پێشوو بە چەپکی گوڵ ڕازابۆوە و هەروەها کەژاوەی سێیەم کە ئەسپەکانی زین و بەرگی سووریان هەبوو. لە پێشەوە ئەمانە کەسانێك کۆمەڵە ئاگردانێکی گەورەی پڕ لە ئاگریان بە دەستەوە بوو. لە ئەنجامدا خودی کورووش لەناو کەژاوەی تایبەت بە خۆی لە دەروازەی کۆشکەوە بەدەرکەوت. کڵاوێکی پاشایی (تیارا)ی لەسەر بوو و بەرگێکی سوور کە ڕەختی سپی لێ دوورابوو و تایبەت بە پاشا بوو و شلوارێکی کورتی سووری ئاڵ و سەر شانێکی سووری بەسەر شانی دادابوو و سەر بەندێکیش بەدەوری (تیارا) بەسترابوو... هەرکە پاشا بەدیارکەوت هەموو کڕنۆشیان بۆی برد. لەوانەیە کەسانێك ئەمریان پێ کرابێ ئەم کارە بکەن و لەبەر ئەوە ئەم نەریتە بەدی هاتبێ و یان ئەم خەڵکە لەبەر گەورەیی و شکۆی بارەگای پاشایی و بەدیارکەوتنی سیمای جوان و ڕازاوەی فەرمانڕەوا ئاوهایان کردبێ... دوای ئەوەی کەژاوەی پاشا بە ڕێکەوت، چوار هەزار سوارچاکی ڕمهاوێژ لە ڕیزی پێشەوەو دوو هەزاری دیکەش لەهەر دوولایەوە بەڕێکەوتن. ئاڵاهەڵگرانی ئیمپراتۆری بە سواری ئەسپ و ڕم بە دەستەوە بەدوایانەوە بەڕێکەوتن. پاشان دوو سەد سەر ئەسپی پەروەردەکراوی ئاخوڕی فەرمانڕەوایی بە لغاوی زێڕین و زین و بەرگی نەخشێنراو، و دوای ئەمانەشەوە دوو هەزار ڕمهاوێژ، ئینجا ڕێزی کۆنترین سوارچاکانی پارسی کە لە دەهەزار [سوار] پێکهاتووە لە ستوونی سەد کەسی شان بەشانی یەکتر...*(٣٩)

لە ریزبەندی کۆمەڵایەتی ئێران، دوای خودی پاشا ڕاستەوخۆ گەورە پیاوان و گەورەی خانەدانەکان بەرزترین پلەی کۆمەڵایەتیان هەبوو. ئەم کەسانە خاوەن زەوی و موڵکدارە گەورەکان بوون، کە بێگومان بەڕادەی دەرەبەگەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا گەورەو پلەدار نەبوون. ئەگەرچی فەرمانڕەوا خاوەنی گشت ناوچەکانی ئێران بوو و سەرجەم زەوییەکان هی ئەو بوون، بەڵام داریووش و جێگرەکانی بەردەوام زەوییان پێشکەش بەو کەسانە دەکرد، کە وەکو ئەفسەر یان سوارچاك لە ڕێزی سوپا سەربازییەکانیاندا خزمەتیان دەکرد. ڕووبەری ئەم زەوییان جیاوازبوو و بە زاراوەی سەربازی ناودەبران. بۆ نموونە دەیانگووت: **((زەوی تیرهاوێژی))**، **((زەوی ئەسپی))**، **((زەوی عارەبانەیی))**و شتی تر... خاوەنی هەرکام لەم جۆرە زەوییانە لەسەریان بوو بەگوێرەی سەروەت و سامانەکەیان سەربازو کەلوپەلی پێویست پێشکەشی سوپا بکەن. بۆ نموونە خاوەنی زەوییەکی تیرهاوێژی کە ڕووبەرەکەی نزیکەی ٨٤ دۆنم بوو، دەبوایە تیرهاوێژێك پێشکەش بە فەرمانڕەوا بکات. ئەم جۆرە زەوییانە بچووکترین زەوییەکان بوون. هەندێ لەو گەورە پیاوانەی کە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە ڕێزیان لێدەگیرا، ڕووبەری زەوییەکانیان دەگەیشتە دەیان هەزار دۆنم.



**کاربەدەستە پایەبەرزەکانی دیوانی ئیمپراتۆرییەتی ئێران بە شێوەی راوەستانی فەرمی ( دەستی راست لەسەر مەچەکی دەستی چەپ) لەناو یەکێك لە نەخشە هەڵکەنراوەکانی کۆشکی تەختی جەمشید دۆزراوەتەوە.**

راگرتنی ئەم زەوی و زار و خانووە گەورانەی کە لەناو ئەم زەوییانە دروست کرابوون، کۆمەڵە کارەکەر و کرێکارێکی پێویست بوو، وەکو جووتیار و بەخێوکەرانی ئەسپ و ئاسنگر و چێشتلێنەر و خزمەتکاری ژن. ژمارەیەکی زۆر کەم لەوانە کرێکار و کاسبکاری سەربەست و ئازاد بوون و رەنجی دەستی خۆیان وەردەگرت. ئەوانی تر زۆربەیان کۆیلەو بەندە بوون. کۆیلەکانی رۆژگاری فەرمانڕەواییەتی هەخامەنیشی وەکو کۆیلەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا پارچە زەوی بچووکی کێڵگەییان لەبەردەست دابوو و لە رێگەی جووتیارییەوە بژێوی ژیانی خۆیانیان دابین دەکردو لە بەرامبەر ئەمە بەشێکی زۆری بەروبوومی بەرهەم هاتوویان دەدا بە خاوەن زەوییەکان. ئەم کۆیلانە لەناو زەوییەکاندا کۆخی بچووکی خشتی یان بەرد یان



حەسیریان دروست دەکرد و لەوێدا دەژیان. هەروەها ئەم کۆیلانە دەیانتوانی لە جیهانی سەربەخۆی زەوی و زاری خاوەن زەوییەکاندا پلەوپایەی بەرزیان دەستکەوێ و ئەرکی گرنگ بە ئەستۆ بگرن. زۆربەیان قەرزداری خاوەنەکانیان بوون و لەبەر ئەوە نەیاندەتوانی مەرجەکانی ئازادکردنی خۆیان فەراهەم بکەن.

وەکو سەرجەم کۆمەڵگا دێرینەکانی رۆژگاری کۆن کۆیلەکان نزمترین توێژی کۆمەڵگا بوون. جێگەی ئاماژەپێدانە کە کۆیلەیەك لە وڵاتی ئێران بەختێکی زۆرتری هەبووە بۆ ئازادکردنی خۆی تاکو کۆیلەیەکی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا. **ئۆمستێد** لەم بارەوە دەڵێت:

*پیاوانی سەربەست ئەگەر قەرزداربانە یان تاوانێکیان کردبا، دەبوونە کۆیلە. خێزانەکان لە کاتی هەژاری و نەداری ناچاربوون رۆڵەکانیان بفرۆشن. ناوە بیانییەکان [لە نووسراوە بەردینە دەستکەوتووەکان] پیشاندەری هەبوونی سەربازی بەدیلگیراو یان ئەو کۆیلانەیە کە لە وڵاتانی دەرەوە هێنراون. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی کۆیلەکان بە باب وباپیرەوە لەناو ماڵی خاوەنەکانی خۆیان لە دایك دەبوون و گەورە دەبوون و دەرفەتی پێکهێنانی ژیان لەناو خۆیانیان پێدەدرا، چونکە پێکهێنانی خێزان لە لایەن کۆیلەکانەوە لە رووی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان بەسوود بوو. کۆیلە ئەگەر هەڵنەهاتبا یان بەدرۆ نەیگوتبا کەسێکی سەربەستە، رەفتارێکی باشی لەگەڵدا دەکرا. بەزۆری کاری زۆر گرنگیان پێ دەسپارد و تەنانەت هەندێ جار سەربەست بوو* [٤٠].

لە سنووری نێوان توێژی سەرەوە و توێژی خوارەوە، رەنجدەرانی سەربەستی توێژی مام ناوەند بەدی دەکران، زۆرینەی ئەم توێژە، کرێکارە کەمدەرامەتەکان بوون. لە تەك ئەو کەسانەی کە لەناو زەوییەکاندا کاریان دەکرد، هەندێکیش سەرقاڵی کۆمەڵە کارێکی وەکو کاناڵکێشی ئاو [یان دروستکردنی بیر] یان دروستکردنی کۆشکەکانی فەرمانڕەوایی بوون. هەندێکیش لە بواری سەربازی دا خزمەتیان دەکرد. نانەوا، گۆشتفرۆش، دێوەرە، و پیشەسازەکان نموونەیەکی بچووکی سەر بە توێژی مامناوەند بوون. لە ریزی سەرەوەی پەیژەی کۆمەڵایەتی شوێنێك بۆ بازرگانان دەستنیشان کرابوو، کە بەزۆری ژیانێکی ئاسوودە و پڕ لە خۆشیان هەبوو. پیشەی ئەم بازرگانانە هێنان و بردنی کەلوپەلی وەکو رەنگی سووری ئاڵ و بەنی فینیقییە (لە کەنارەکانی فەلەستین)، بۆنی عەرەبستانی، داری دوورگەی کێرتی یۆنان، دانەوێڵە و جام و کریستالی میسر، و بەهارات و زێڕی هیندستان بوو.

## درزی ڕەگەزایەتی لە ئێراندا

بە شێوەیەکی گشتی بە هۆی کەمبوونی بەڵگەی مێژوویی، زانیارییەکی ئەوتۆمان لەبەردەست دانییە لەبابەت داب و نەریت و بیروباوەڕی تاکەکانی ئەم توێژە جیاجیایانەی ناو کۆمەڵگا. ئەو زانیارییانەی کە لەبەردەست دانە لە سەرچاوە یۆنانییەکانەوە وەرگیراون. ئەم زانیارییانەش بەزۆری لەبارەی توێژەکانی سەرەوەیە. بۆ نموونە هیرۆدۆت دەڵێت؛ بەگزادەکانی ئێرانی کەسانێکی لەخۆبایی و لووتبەرز بوون، "لە جیهاندا خۆیان لە هەموو کەس پێ‌گەورەتر و پایەبەرزتر دەزانی و سیفەتە باشەکانی نەتەوەکانی تر بە گوێرەی مەودای دووری و نزیکی لەواندا کەم دەبۆوە، و سیفەتی دانیشتوانی ناوەندی ئێران [واتا **پارس**] لە گشتیان بە نرختر بوو.(٤١)"

هەروەها هیرۆدۆت لە بابەت گرنگی ((پیاوەتی)) لەناو ئێرانییەکاندا بە زێدەڕۆوییەوە دەدوێت، چونکە ئێرانییەکان لە بەراورد لەگەڵ نەتەوە دێرینەکانی تر کۆمەڵگایەکی پیاوسالار بوون. هیرۆدۆت دەنووسێ: "دوای نواندنی دلاوەری لەناو جەنگدا، گرنگترین ڕێگە بۆ سەلماندنی پیاوەتی، پێکهێنانی خێزانێکی گەورەو هەبوونی کوڕی زۆر بوو. ئەو کەسانەی کە کوڕی زۆرتریان هەبوو، هەموو ساڵێك لەلایەن فەرمانڕەواوە خەڵات دەکران." **هیرۆدۆت** لە بابەت پەروەردەکردنی کوڕ لەناو توێژەکانی سەرەوەی کۆمەڵگاوە دەڵێت:

*تەمەنی فێرکردن و پەروەردەکردنی هەر کوڕێك لە نێوان پێنج تا بیست ساڵانەیە و سێ شتی فێردەکرێ: سوارچاکی، تیرهاوێژی و ڕاستگۆیی. هەموو کوڕێك تاکو تەمەنی پێنج ساڵی لەگەڵ دایکی دەژییێت و هەرگیز باوکی خۆی نابینێت. ئەمە بۆ ئەوەیە ئەگەر منداڵ لە قۆناغەکانی سەرەتایی پەروەردەکردندا بمرێت، باوکی زۆر غەمبار نەبێت(٤٢).*

بە پێچەوانەی پیاوان ژنەکانیان فێری هیچ شتێك نەدەکران یان پەروەردەکردنیان ئەوها نەبوو، بەشێوەیەکی گشتی وەکو بوونەوەرێکی نزمتر هەڵسووکەوتیان لەگەڵ دا دەکردن. ئەمە زۆرتر بۆ باوبوونی فرەژنی دەگەڕێتەوە. بەپێی نووسراوەکانی هیرۆدۆت زۆربەی پیاوانی سەر بە توێژی سەرەوە، جگە لەوەی کە چەند هاوسەرێکیان هەبوو، هەرکامیان خاوەن هاوسەری نایاسایی و چەند دولبەرێکی تریش بوون. بە شێوەیەکی گشتی ئافرەتی ئێرانی وەکو زۆربەی ئافرەتانی یۆنانی ژیانێکی گۆشەگیرانە و جیاوازیان هەبوو و زۆربەی کاتەکانیان لەناو ((شوێنی حەوانەوەی تایبەتی ئافرەتان)) بەسەر دەبرد. تەنیا جیاوازییەك کە هەبوو ئەوە بوو، کە ئافرەتی یۆنانی لە هەندێ کاتدا سەرقاڵی ریستنی پەمۆ و ئەرکی تری ماڵداری دەبوون، کەچی



ئافرەتانی سەر بە توێژی سەرەوەی کۆمەڵگای ئێرانی بە پێی ئەو پەروەردەیەی، کە هەیانبوو ئەنجامدانی هەر کارێکیان بە پەست و ناپەسەند دادەنا، جا لەبەر ئەوە خزمەتکارەکانیان کارەکانی ناو ماڵیان رادەپەڕاند.

پیاوان و ژنانی ئێرانی لەگەڵ ئەوەشدا کە بە هۆی جۆری ڕەگەز لێك دوورکەوتبوونەوە، هەندێ جار زۆر یەکتریان خۆشدەویست و خۆشەویستی خۆیانیان پێشکەش بە یەکتری دەکرد. چیرۆکی ئەوینداری و خۆشەویستی نێوان

"ئابراداتا Abradatas" و "پانتێ ئا Panthea" کە لە کتێبی گەزنەفۆن بە ناوی "پەروەردەکردنی کورووش" دا هاتووە، پیشاندەری ئەم هەست و سۆزەی ناخی ئەوانە. غەمباری و حەسرەتی ئەم ژن و پیاوە لە کاتی ڕۆیشتنی پیاوەکە بۆ مەیدانی جەنگ، لە ئەدەبیاتی ڕۆژگارەکانی دوواتر بەرچاو دەکەوێت:

*پانتێ ئا داوای لە ئامادەبووان کرد، تاکو پێشی چۆل بکەن و ئینجا بە هاوسەرەکەی گووت: ئابرادات ئەی خۆشەویستی دڵی من... ئەگەر لەم جیهانەدا چەند ئافرەتێك هەبن، کە هاوسەری خۆیان لە گیانیشیان خۆشتربوێ من یەکێك لەوانم و ئەمەش لە ژیانی هاوبەشمان بە ئاشکرایی بەدی دەکرێ، کەواتە پێویستی بە درکاندن نییە، چونکە خۆت باش دەزانی کە تۆم چەندە خۆشدەوێ. سوێندبێ بەخۆشەویستییەکەمان ئاواتم وایە، لە تەك هاوسەری پاڵەوانی خۆمدا لەناو گۆڕدابم، تاکو لە تەك هاوسەرێکی پەست و ترسنۆك لەناو خۆشی دا... کاتێك کە پانتێ ئا قسەی دەکرد، ئابرادات بەسۆز و خۆشەویستییەکی زۆرەوە گوێی لێ گرتبوو و کاتێك کە قسەکانی تەواو بوو، دەستی لەسەر سەری داناو سەیرێکی ئاسمانی کردو بەم جۆرە پاڕاوە: "ئەی پەروەردگاری جیهان، وابکە تاکو بۆ پانتێ ئا هاوسەرێکی شایستەو بۆ کورووش... هاوڕێیەکی شیاو بم." ئینجا دەرگای کەژاوەی کردەوەو سەرکەوت. کەژاوەچی دەرگاکەی داخست و پانتێ ئا، کە نەیدەتوانی هاوسەری خۆی لە باوەش بگرێ خۆی خوارکردەوە و چەند جارێك کەژاوەکەی ماچ کرد. لەم کاتەدا کەژاوەکە بە ڕێکەوت و بێ ئەوەی، کە ببینرێت بە دوایەوە ڕۆیشت تاکو ئابرادات بەرەو رووی گەڕاوە ئەوی بینی و هەرای کرد: "پانتێ ئای خۆشەویست، خۆڕاگربەو چاوەڕوان بە. خوات لەگەڵ و زوو بەرەو ماڵەوە بگەڕێوە(٤٣)."*

**پەیڕەوکردنی مۆدێلی ڕۆژ لەلایەن ئێرانییە دەوڵەمەندو ناودارەکان**

ئەم بەشە لە کتێبی **"پەروەردەکردنی کورووش"** نووسینی **گەزنەفۆن** دەسەلمێنێ توێژی سەرەوەی کۆمەڵگای ئێران، بەردەوام هەوڵی داوە تاکو بە بەکاربردنی دوایین مۆدێلەکانی جل و بەرگ، پێڵاوی پاژنە بڵندو کەلوپەلی ئارایشکردن سیمای خۆیان بە جوانترین شێوە بڕازێننەوە.

"[کورووشی گەورە] جل و بەرگی مادی دەبەردەکرد و داوای لە هەواڵەکانی دەکرد کە ئەم جل و بەرگە بکەنە بەریان. چونکە پێی وابوو، هەموو کەسێك بەجۆرێك کەموکوڕی هەیە و جل و بەرگی شیاو دەتوانێت یارمەتی بدات، تاکو ئەم کەموکوڕیانەی بشارێتەوە و پیاو ڕێکوپێك ترو بالاّ بەرزتر بەدیار بکەوێت. لەبەر ئەوە ئەمانە جۆرە پێڵاوەکیان دەکردە پێیان، بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ بالآی بەرزتر دەکردن. هەروەها دەیگووت کل لە چاوانیان بدەن تاکو چاویان بدرەوشێتەوە و سیمای خۆیان بە کەلوپەلی جوانکاری و ئارایش دەڕازاندەوە تاکو جوانتر بن."

## ئەو کەسەی کە قەرزدارە بە ناچاری دەبێ درۆ بکات

ئەم گووتەی **پانتێ ئا** "ئاواتم وایە لە تەك هاوسەرە پاڵەوانەکەم لەناو گۆڕدابم، تاکو لە تەك هاوسەرێکی پەست و ترسنۆك لە خۆشیدا بەسەر بەرم..." بێگومان هێمایە کە بۆ بنەماو ڕێچکەی ڕەسەن و بەرزی ئابڕوو و ڕاستگۆیی، کە سیمبوولێك بووە بۆ توێژەکانی سەرەوەی کۆمەڵگا. **داریووشی یەکەم** کە خۆی بە سیمبوولی خەڵکی داهاتووی ئێران و جیهان دادەنا، هەم لە ژیان و هەمیش لە نووسراوە بەردینەکانی خۆیدا، کە لە بناری چیاکان لەسەر قەدی چیاکان نەخشێنراون، دانی بە زۆربەی ڕێچکەکانی ئەم بنەمایە داناوە:

*"بەخواستی ئاهووڕامەزدا کەسێکم لایەنگری ڕاستی، هاوڕێی خراپی نیمە. ناخوازم [کەسێکی] بێ توانا لەلایەن [کەسێکی] بە دەست و توانا ستەمی لێ بکرێ. نەخواستی من [ە][کەسێکی] بەتوانا لەلایەن بێ تواناکەوە بێ ڕێزی لێ بکرێ. ئەو شتەی ڕاستی [یە] خواستی من[ە]. پیاوی درۆزنم خۆش ناوێ... بەتوندی جڵەوی خواست و ئارەزووەکانی دەروونی خۆمم گرتووە. ئەو کەسەی کە هاوکاریمان دەکات لە بری هاوکارییەکانی، پاداشتی دەدەمێ. ئەو کەسەی کە زیانمان پێ دەگەیێنێ لە بەرامبەر زیانەکانی سزای دەدەم. پێم خۆش نییە هیچ کەسێك [نافرمانی بکات] و زیان بەکەس بگەیێنێ. تەنانەت پێشم باش نییە ئەو کەسەی زیان بە کەسێك بگەیێنێت، سزا نەدرێت[٤٤].*"





**ژنانی سەربە توێژی سەرەوەی کۆمەڵگەی ئێرانی ژیانێکی خۆش و ئاسوودە، بەڵام گۆشەگیرانە و تەواو جیاوازیان هەبوو. لەم وێنە خەیاڵییە ئافرەتێکی ئێرانی لەتەك دەستەخوشك و خزمەتکارەکەی کە لە گۆشەیەك وەستاوە، بەرچاو دەکەوێت.**

بێزاری و دوورکەوتنەوەی داریووش لە درۆ کارێکی شیاو و واتادارە. بە پێی نووسراوەکانی هیرۆدۆت، ئێرانییەکان ((درۆ و قەرزداربوونیان)) پێ لە هەموو شتێك ناشرین تر بوو.

"کۆمەڵە بەڵگەیەك لەبەر دەست دانە، کە دەسەلمێنن ئێرانییەکان لە قەرزداربوون دوور دەکەوتنەوە، بەڵام لایەنی سەرنجڕاکێش و گرنگی ئەم بیروباوەڕەیان ئەوەیە، کە هەر کەسێك قەرزداربێت، ناچار دەبێ درۆش بکات.[٤٥]" دیار نییە سزای درۆکردن چی بووە، بەڵام سزای تاوانەکانی تر چ بۆ کەسانی سەر بە توێژی سەرەوەو چ سەر بە توێژی خوارەوەی کۆمەڵگا زۆر قورس بووە. بۆ نموونە سزای تاوانی پیاوکوژی، دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەت و خیانەت، کوشتن بووە، کە ئەمەش بە شێوەی لە خاچدان یان خنکاندن لەناو قوولکەیەکی پڕ لە خۆڵەمێش جێبەجێ دەکرا. تەنانەت سزای تاوانی بچووکتریش بە شێوەی کوێرکردنی تاوانبار یان پەڕاندنی دەست و پێیان، بەڕێوە دەچوو.

لەلایەکی ترەوە هیرۆدۆت و نووسەرەکانی تری ڕۆژگاری کۆن هاوڕانە، کە زۆربەی ئێرانییەکان خەڵکانێکی سازگار و نەرم و نیان و ملکەچی قانوون و ڕێساکانی کۆمەڵگا بوونە. بەزۆری ئەو کەسانە کەسانێکی سەر بە توێژێکی کۆمەڵگا بوون، کاتێك یەکتریان دەبینی ڕێزیان لە یەکتر دەگرت و لێوی یەکتریان ماچ دەکرد. ئەو کەسانەی کە تاڕادەیەك پلەی

کۆمەڵایەتییان لێك نزیك بوایە، تەنیا کوڵمی یەکتریان ماچ دەکرد، کردەوەیەك کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بە تەواوی پەیڕەوی لێدەکرێ. هەروەها بە دڵ پێیان خۆشبوو بەژداری ڕێوڕەسمەکانی جەژن و خواردنەوەی شەراب و بەرپاکردنی ڕێوڕەسمی جەژنی لە دایکبوونی خۆشەویستەکانیان بکەن. هیرۆدۆت دەڵێت: "ئێرانییەکی دەوڵەمەند لە جەژنی لە دایکبوونی خۆیدا لەوانەیە گا یان ئەسپ یان حوشتر یان کەرێك سەربڕێت و سووری بکاتەوەو خوانی میوانداری بڕازێنێتەوە. ئەگەر کەسێکی نەدار بێت، ئەوە تەنیا گیانلەبەرێکی بچووك دەکاتە قوربانی. لەسەر خوانی میوانداری خواردنی سەرەکی زۆر بەرچاو ناکەوێت، بەڵام جۆرەکانی سەلاتە کە چەند جارێك پێشکەش بە میوانەکان دەکرێت زۆرە. ئەمە بووە هۆکارێك تاکو یۆنانییەکان لەسەر خوانی میوانداریەتی ئێرانییەکان بە برسێتی بکشێنەوە، چونکە ئێمە هیچ شتێکمان پێ لەوە باشتر نییە، کە چەند جارێك خواردنمان بۆ بێنن.(٤٦)"



**پیاوانی سەربە توێژی سەرەوە لەکاتی خواردن. سەبارەت بە خۆراکییەکانیان زانیارییەکی ئەوتۆمان لەبەر دەست دا نییە، جگە لەوەی، کە هیرۆدۆت دەڵێت: خۆراکی سەرەکی کەم، بەڵام جۆرەکانی سەلاتە زۆر بوونە. (ئەم وێنەیە بۆ سەردەمی قاجارەکان دەگەڕێتەوە ــ وەرگێڕی فارسی).**



## دژایەتی بەردەوامی نێوان رووناکی و تاریکی

ڕێوڕەسمەکانی تر پەیوەندییان بە نەریتە ئایینییەکانەوە بوو. زۆربەی ئەو نەتەوەو گەلانەی لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی ئێران دابوون و تەنانەت دوای ئەوەی کە لەناو ئیمپراتۆری ئێراندا توانەوە، هەروا خواوەندانی رەسەنی خۆیانیان دەپەرست. خودی ئێرانییەکان لە سەرەتادا و بەر لە هەخامەنیشەکان باوەڕیان بە فرەیەزدانی هەبوو و خواوەندانی سروشتیان دەپەرست، ئەم خواوەندە سروشتییانە لە دێو **(دێئۆڤا)**کانەوە، سەرچاوەیان دەگرت. لەناو ڕیزی ئەم خواوەندانەدا خواوەندێکی ئاسمانی بەناوی **ئاهوورامەزدا** بەرچاو دەکەوێت، کە پێشتر لە باکوور دەپەرستراو لە کۆتاییەکانی هەزارەی دووەمی پێش زایین لە ناوەندو بانی ئێران سەرەنجی پێدرا.



**ئەم نەخشە هەڵکەنراوەی سەر بەرد کە لە تەختی جەمشید دۆزراوەتەوە، لەکاتێکدا ئیمپراتۆری ئێرانی بە وێنە کێشاوە، کە خەریکی پەرستنی ئاهوورامەزدایە، لەکاتێکدا کە گەل و هۆزە جیاجیاکانی سنووری ئیمپراتۆرییەتی ئێران لە ژێرەوە راوەستاون و ئیمپراتۆریان راگرتووە.**

لەو ناوەدا پەیامبەرێکی گەورە بەناوی "**زەردەشت** Zoroaster" پەیدابوو، کە یۆنانییەکان و گەلانی تری ڕۆژئاوایی دواتر ((**زۆرۆ ئاستێر**)) یان پێگووتووە. سەردەمی ژیانی زەردەشت و بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە دیارنییە و لەلایەن زاناکانەوە مشتومڕی لەسەرە. زۆربەی زاناکان رایان وایە؛ زەردەشت لە سەرەتای سەدەی نۆیەم یان **سەدەی شەشەمی پێش زایین** ژیاوە. لە بنەڕەتدا زەردەشت **یەکتاپەرست** بوو و ئەهوورامەزدای وەکو ((**خواوەندی بیر**)) و تاکە خواوەندی راستی، ستایش دەکردو دەیپەرست. وابیردەکراوە، کە ئاهوورا مەزدا سەرقاڵی ململانێیەکی بەردەوامە لەگەڵ هێزی خراپەکاری یان شەیتان، کە **[لە کتێبی ئاڤێستا]** ((**ئەنگرا مەینوو** Angra Mainu)) و دواتر **ئەهریمەنی** پێگووتراوە. ئێرانییەکان بەزۆری سیمای **ئاهوورامەزدایان** بەو جۆرەی، کە لە نووسراوە بەردینەکانی **بێستوون** لەلایەن داریووشەوە نەخشێنراوە بە وێنەکێشاوە. بە پێی وەسفەکانی **ئۆمستێد** وێنەی نەخشێنراوی یەزدان لە سەرەوەی پەیکەری پاشا هەڵواسراوە.

> *لە سەرەوەی پەیکەری پاشا [داریووش] خواوەندی بەڕیش، کڵاوێکی لەسەرە کە هێڵە سیمبولیکە ئاسمانییەکان و رووبەرێك کە هەشت تیشکی خۆری لەسەر نەخشێنراوە، ئەم خواوەندە لە پاشا جیادەکاتەوە... جل و بەرگەکەی تەنپۆشێکی درێژە و سەردەستەکانی بە مەچەکی دەستبەندیەوە لکاوە. لەدەستی چەپیدا بازنەیەك بەدی دەکرێ، کە پلەی فەرمانڕەوایەتی پێشکەش بە پاشا دەکات. دەستی راستی بە هێمای نزاو پاڕاناوە بەرەو ئاسمان کراوەتەوە. بازنەیەکی لەناو قەد دایە و [بەیارمەتی] باڵەکانی بەرەو ئاسمان بەرزفڕیوە... و دوو جووتە باڵەکان، کە بە دوو لای بازنەکەوە لکاون، لە ئاسماندا رایدەگرن*[٤٧].

**ئایینی زەردەشتی** ئاینێکە کە لە پەروەردەکانی زەردەشتی پەیامبەرەوە سەرچاوەی گرتووە و داریووش و جێگرەکانی پەیڕەوی ئەم ئایینە بوونە[*]. ئەم ئایینە کۆمەڵە بنەمایەکی بونیاتی

(*) لەناو ئەو نووسراوە بەردییانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ رۆژگاری هەخامەنیشییەکان ناوی ئاهوورامەزدا هاتووە، ئەمەش بەواتای ئەوە نییە، کە هەخامەنیشییەکان زەردەشتی بووبن. چونکە لەتەك ناوی ئاهوورامەزدا ناوی کۆمەڵێك خواوەندی تری وەکو، میترا، ئاناهیتاش لەناو ئەم نووسراوە بەردییانە بەدی دەکرێن. زۆربەی لێکۆڵەران پێیانوایە؛ هەخامەنیشییەکان ئایینێکی تایبەت بە خۆیان هەبووە، کە جیا لە ئایینی زەردەشتییە. تەنیا خاڵی هاوبەشی نێوان ئایینی زەردەشتی و ئایینی هەخامەنیشی، ناوی



و رەسەنی هەبوو. یەکێك لە بنەماکانی ئەوەبوو تاکی رەوشتبەرز کەسێك بوو، کە لەگەڵ دراوسێکانی لەناو ئاسایش و ئاشتی و هاودەنگی و هاوتەریبی دا ژیان بەسەر بەرێت[٤٨]. بنەمایەکی تر ئەوەبوو، کە ئادەمیزاد بەردەوام دەبویە لە بەرەو تاریکی و کوێرەرێی رۆیشتن بەدەستی ((دێوە)) کۆنەکانەوە دووربکەوێتەوە. دێوەکان ئەو گیانە ناپاك و بەدڕەوشتانە بوون کە هاوکاری ئاهریمەنیان دەکرد. کەواتە ژیانی ئادەمیزاد ململانێی نێوان باشی و خراپییە هەر بەو جۆرەی، کە خودی خواوەندیش لەم ململانێیەدا بەژدارە.[**] ململانێی نێوان هێزەکانی باشی و خراپی، رووناکی و تاریکی.

ئەم بیرو هزرانە لەگەڵ هزرو بیروباوەڕەکانی تری زەردەشت بە درێژایی مێژوو لە چوارچێوەی کۆمەڵە نووسراوێك بەناوی ((**ئاڤێستا**)) کۆکراونەتەوە. پلەوپایە ئایینییەکانی ئەم دینەش بەدی هاتن . کاهینانی ئەم ئایینە کە سەربە هۆزی ((**مادی**)) بوون ((**موغ**)) [ Mag ] یان پێ دەگووترا. وشە نوێکانی[ Magic **ئەفسووناوی**]و [ Magician **جادووگەر**] لەم ناوەوە وەرگیراون، چونکە ئەم موغانە کۆمەڵە رێورەسمێکیان هەبوو، کە لەسەر بنەمای خەون و خەیاڵ و ئەستێرەناسی و جادووگەرییەوە بونیات نرابوون[٤٩]. موغەکان جگە لەمە باوەڕیان زۆر بەوە هەبوو، کە هەندێ لە گیانلەبەران وەکو سەگ و گا باشن و هەندێکی تر ((خولقێنراوی دەستی ئاهریمەنن))و دەبێ لەناو ببردرێن. ئەم خولقێنراوە ئاهریمەنیانە بریتی بوون، لە گیانلەبەرە خشۆکەکان، مێروو و مێش، کرم، بۆق و مارەکان و گیانلەبەری تری لەم چەشنە.

ئاهوورامەزدایە. بەڵام ئایینی زەردەشتی یەکتاپەرستییە، کەچی فەرمانڕەوایانی هەخامەنیشی، جگە لە ئاهوورامەزدا کۆمەڵێك خواوەندی تریشیان پەرستووە. واتا لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی هەخامەنیشییەکان هێشتا ئاهوورامەزدا وەکو خواوەندێکی تاقانەی لێنەهاتووە و لەتەك میترا و ئاناهیتا پەرستراوە. فارسەکان لە مێژووی خۆیاندا هەوڵێکی زۆریان داوە تاکو بسەلمێنن هەخامەنیشییەکان زەردەشتی بوونە، بەڵام راستییە مێژووییەکان بەپێچەوانەی ئەم هەوڵانەبوون. (وەرگێڕی کوردی).

(**) بەپێی گاتاکان لە ئایینی زەردەشتیدا ئاهوورەمەزدا خواوەندی بەدیهێنەرە و هەموو شتەکان خولقێنراوی گارگەی ئەهوورایی ئەم خواوەندەنە. کەواتا ئاهوورەمەزدا خواوەندی یەکتا و تاقانە و خولقێنەرە. ئاهریمەنیش کە بە خواوەندی خراپی ناسراوە خولقێنراوی دەستی پەروەردیگاری زانایە. جابۆیە ئەو بیروباوەڕەی کە دەڵێت، ئاهوورەمەزدا وەکو خواوەندی باشی بەردەوام لەگەڵ ئاهریمەن کە خواوەندی خراپییە لە ململانێ و دژایەتیکردن دایە، باوەڕێکی دروستکراو و شێوە دەسکاریکراوەکەی ئایینی ڕەسەنی زەردەشتییە، کە لەلایەن مۆغەکانی ئایینی مۆغانییەوە پێشکەشکراوە. (وەرگێڕی کوردی).

**سروودەکانی نزای ئاهوورامەزدا**

ئەم چەند دێرە دوایین ستایش و سروودەکانی نوێژی زەردەشتی پەیامبەری ئایینی زەردەشتییە (کە **ئۆمستێد** لە کتێبی **"مێژووی ئیمپراتۆرییەتی ئێران"** لە وەرگێرانەکەی **"جەیمز دارمێستێر** James Darmester"ەوە نەقلی کردووە.)

"من، ئەو کەسەی کە بە((هزری باش)) [بەهمەنی[دڵمم بۆ تێڕامان لە گیانم ڕاسپارد، ئەو کەسەی، کە پاداشتەکانی ئاهوورامەزدام بۆ کردارەکانم بینی، لە کاتێکدا تواناو هێزی ئەوەم هەیە، فێری خەڵکی بکەم بەدوای ((ڕاستی)) [ئاشا Asha ]دا بگەڕێن. ئەی ((ڕاستی)) کەی ئەو ڕۆژە دێت کە من تۆ ببینم؟ بە یارمەتی پەیڤی پیرۆز لەسەر زمانەکانمان بتوانین دزەکانی مێگەل بەرەو ڕێگەی ڕاست بگەڕێنینەوە [وا لە کەسی ناپاك بکەین کە باوەڕی بەخوای تاقانە و خوای ڕاستین هەبێت]... ئێمە هەوڵ دەدەین سروودەکانی ستایشکردنمان پێشکەش بە تۆ بکەین... چونکە من وادەکەم ((ڕاستی))و ((هزری باش)) بۆ هەمیشە بەردەوام بمێننەوە، تۆ ئەی مەزدا بە هزری خۆت فێرمان بکە و لە زمانی خۆتەوە پێمان بڵێ سەرەتای جیهان چۆن بووە."

ڕێوڕەسمی بە خاك سپاردنی مردووەکانیش لە لایەن موغەکانەوە بەڕێوە دەچوو. لاشەی مردووەکانیان لە شوێنێکی بەرز و کراوە دادەنا تاکو باڵندەو گیانلەبەرانی تر گۆشتی مردوو لە ئێسکەکەوە داماڵن و ئینجا دوایی ئێسکانەکەیان دەناشت. بە پێچەوانەی ئەم موغانە زۆربەی خەڵکی ئێران بەم جۆرە مردووەکانی خۆیانیان نەدەناشت. باوترین شێوە لەناو کۆمەڵانی خەڵکی ئێران ئەوەبوو، کە ڕۆن (یان شەمێ - مۆمی هەنگوین)یان لە لەشی مردوو هەڵدەسوی و دوایی دەیان ناشت. و تەنانەت کەسانێکی پابەند و ئیمانداری وەکو داریووش وایان پێ باشتربوو، کە لەناو گۆڕە بەردییەکاندا بناشرێن تاوەکو بەشێوەی موغەکان بە خاك بسپێردرێن. ئەم خاڵەو چەند ناکۆکییەکی تری کە لە نێوان ڕێوڕسمە ئایینییە باوەکانی ناو کۆمەڵانی خەڵکی ئێران و شێوازەکانی موغان بەدی دەکرێ، بۆ زانایان و لێکۆڵەران بەدیار دەخات، کە کۆمەڵە دەستەیەکی جیاجیای ئایینی یان چەندین ڕاو شیکردنەوەی ئایینی لە ئێران دا هەبووە. بەم چەشنە موغەکان ئایینێکی وشك و تەواو مەزهەبیان جێبەجێ دەکرد، کە زۆر بە دەگمەن لە لایەن پاشاو بەرپرسانەوە پەسند دەکراو توێژەکانی خوارەوەی کۆمەڵگاش ڕێوڕەسمی جیاواز و



تایبەت بە ئایینی خۆماڵی و ڕەسەنی خۆیانیان هەبوو. لەوانەیە دۆزینەوە شوێنەوارناسییەکانی داهاتووی شوێنەوارناسان ئەم نهێنیانەمان بۆ ئاشکرا بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی ئێستا ئەم بابەتەش وەکو زۆربەی لایەنەکانی کوولتووری و ژیانی ئێرانییەکان لەناو تەمومژی کات و زەمەندا داپۆشراوە.



**موغێکی سەربە ڕۆژگاری کۆنی ئێران و شاگردەکانی، خەریکی خوێندنەوە و بەسەرکردنەوەی ئەو بابەتانەن، کە لەسەر پاپیرووسەکان نوسراون. پێدەچێت موغە گەورە و پایەبەرزەکانی ئێرانی کۆن، نەریت و ڕێوڕەسمی ئایینی زۆر ئاڵۆزیان بەدی هێنابێت**

## (٥)

## یەکەمین هەنگاو بەرەو ئەوروپا

## داریووش رووبەڕووی یۆنانییەکان دەبێتەوە

لە ساڵی ٥١٢ ی پێش زایین لەشکرێکی سەربازی لە رێگەی ئاسیای بچووکەوە بەسەرکردایەتی داریووش، لەناوچەیەك کە ئێستا دڕناڵی **"بۆسفێر"**ی پێدەگووترێ، تێپەڕین و چوونە ناو تەراکییەوە. تەراکییە ناوچەیەکی ناهەموار بوو، کە دەکەوتە لێواری باکووری دەریای ئیژەو لە رۆژگارێکی زووەوە یۆنانییەکان لەوێدا دەژیان. زۆربەی هۆزەکانی **تەراکییە** هەر زوو و بێ هیچ بەرگریکردنێك خۆیان بەدەستەوە دا و سوپای داریووش بەرەو باکوور بە رێکەوت. لە رووباری دانووب تێپەڕی و پێی نایە ناو ئەو دەشتە بەرفراوانانەی، کە دواتر باشووری رووسیایان پێکهێنا. مێژوونووسان ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی لێکۆڵینەوە لەو هۆکارانە بوون، کە وای لە داریووش کرد بۆ یەکەمین جار ئێران هێرش بکاتە سەر خاکی ئەوروپا. هەندێ پێیان وایە؛ داریووش ویستوویەتی تۆڵە لە دانیشتووانی ئەم دەشتانە بکاتەوە کە ئێسکیتە بیابانگەردەکان بوون، چونکە ئەمانە نزیکەی سەدەیەك لەمەوبەر هێرشێکی سەخت و توندیان کردبووە سەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەندێکی تریش پێیان وابوو؛ ئەو دەنگۆیانەی کە سەبارەت بە خەزێنە پڕ لە زێڕەکانی ئێسکیتەکان لەئارادابوو، داریووشی هەڵخەڵەتاند بوو. هەندێکی تریش ئەم هەنگاوەی داریووش بە بەردەوامی رێگەی پێشینیانی لەسەر ئامانجی بەرفراوانکردنی ئیمپراتۆری دادەنێن.

بێگومان گشت ئەم بۆچوونانە ئامانجەکانی داریووشی لێدەکەوێتەوە، بەڵام لە ئەنجامدا بەرفراوانکردنی ئیمپراتۆری بە بەهێزترین و گرنگترین ئامانجی داریووش دادەنرێت. کۆمەڵە بەڵگەیەکی دیار لەبەر دەست دانە، کە پیشاندەدەن داریووش پلانی داگیرکردنی سەرانسەری ئەوروپای دارشتبوو. کەمێك پاش هێرشکردن بۆ سەر تەراکییەو نیشتمانی **ئێسکیتەکان** (و لەوانەیە هەر دوا بەدوای ئەم هێرشە)، چەند کەشتییەکی بۆ شارەزابوون و مەبەستی هەواڵگری و کێشانەوەی نەخشەی کەنارەکانی یۆنان و باشووری ئیتاڵیا رەوانەکرد. پێدەچێ ئەم کەشتییانە



تەواوی سەرزەمینەکانی رۆژئاوایان بەسەر نەکردبێتەوە، چونکە داریووش هەرگیز نەیتوانی سیمایەکی تەواو و کتومتی سەرزەمینی بەرفراوانی جیهانی **مەدیتەرانەیی- ئەوروپایی** و چۆنییەتی نیشتمان و گەلەکانی ئەم هەرێمە جوگرافیاییە بەرفراوانە، بێنێتە بەرچاوی.

یۆنان بە هۆی هەڵکەوتی ستراتیژیکی خۆی بە تایبەتی، کە کەوتۆتە لێوارەکانی دەریای ئیژە، ناوچەو شوێنێکی گرنگ بوو بۆ دزەکردنی ئێران بۆ ناو خاکی ئەوروپا. یۆنانییەکان چ خەڵکی ئیونییە و چ خودی یۆنانییەکان کۆسپ و تەگەرەیەکی زۆریان خستە بەردەم داریووش بۆ نەگەیشتنی بە ئامانجەکانی. لە ماوەی بیست ساڵی دوای هێرشبردنە سەر نیشتمانی ئێسکیتەکان داریووش هەواڵێکی دڵتەزێن و ناخۆشی بیست سەبارەت بە شۆڕشی یۆنانییەکان دژ بە ئەو و سووتاندنی شارێکی گرنگی ئێرانی و تەنانەت لەناوچوونی دەستەیەك لە سوپا سەربازییەکانی، بەڵام گرنگییەکە لەوە دایە دوور لە بایەخی گرنگی ئەم رووداوە، شای گەورە بە لەبەردەست دابوونی سەرچاوەیەکی گەورەی مرۆیی و مادی، ئەم کێشانەی **دەوڵەت — شارە** بچووکە یۆنانییەکانی تەنیا بە کۆسپ و کێشەیەکی بچووك دادەنا. لەماوەی جەنگە بەناوبانگەکانی ئێران و یۆنان لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین، یۆنان هەرگیز بۆ ئیمپراتۆری ئێران هەڕەشەیەکی جدی نەبووە.

## هێرشی داریووش بۆ سەر ئێسکیتەکان

داریووش یەکەمین گەشتی مەترسیداری خۆی بۆ ناو ئەوروپا بە ئەنجامدانی کۆمەڵە کارێکی ژیرانە دەست پێکرد. بەرپرسانی سەربازی خۆی بە ساتراپی **کاتپاتووکا** (کە یۆنانییەکان **کاپادۆسیا[کاپادۆکیا]**یان پێدەگووت) دەکەوێتە سنوورەکانی دەریای رەش لە باکووری ئاسیای بچووك ئاگادارکردەوە، تاکو کەشتییەکانیان بەرەو کەنارەکانی باکووری دەریا ببەن و بەسەر نزیکترین دێهاتەکانی لێواری دەریا دابدەن. ئامانجی ئەم هێرشبردنە کە بەدیل گرتنی یۆنانییەکان بوو، بەسەرکەوتوویی بەڕێوەچوو. یەکێك لە دیلەکان کە برای یەکێك لە سەرۆك هۆزەکان بوو کۆمەڵە زانیارییەکی گرنگ و باشی لە بابەت **ئێسکیتەکان** و نیشتمانەکەیان دایە بەردەستی ئێرانییەکان.



**لەوانەیە وردەکارییەکانی بەرگی ئەم جەنگاوەرە ئیسکێتییە بۆ رۆژگاری دوای هێرشی داریووش بۆ سەر ئەوروپا بگەڕێتەوە.**

ئێسکیتەکان کۆمەڵە هۆزێکی نیمچە بیابانگەرد بوون و بەزۆری لە رێگەی بەخێوکردنی گاو مەڕو ماڵات بژێوی ژیانی خۆیانیان دابین دەکرد. ئەگەرچی ئەم هۆزانە شار یان شێوەیەکی نووسین یان دەوڵەتێکی رەسمی وەکو ئێران و یۆنانیان نەبوو، بەڵام هۆزێکی سەرەتایی و



دواکەوتوو نەبوون. ئێسکیتەکان کۆمەڵە هۆزێك بوون، کە بە هۆی یەکێتییەکی سیاسی لاوازەوە پەیوەندییان پێکەوە هەبوو و لەکاری رێستن و کۆتاڵدا خاوەن پیشەو هونەرێکی ناسك و جوان بوون. هەروەها جلدە زۆر جوانە رازاوەکان، و پیشەسازی مسکاری و مەفرەغی و زێڕ لە ریزی بەرهەمە گرنگەکانی ئەم هۆزانە بوون. جەنگاوەرانی ئێسکیتی تیرهاوێژانێکی کارامە بوون و بە کەللەڕەقی و هەروەها نەریتی کۆکردنەوەی کاسەی سەری دوژمنانی شکستخواردوو ناویان دەرکردبوو. بەزۆری کەللەسەری ئادەمیزادیان وەکو جامی شەراب بەکاردەبرد و بەناوقەدیانەوە هەڵیاندەواسی.[٥٠]

ئەگەرچی ئێسکیتەکان خەڵکێکی خوێنمژ و بێبەزەیی و بەدەست و برد بوون، هاوکات ئەوەندەش نەزان نەبوون، کە نەزانن نابێ گێلانە و نەترسانە رووبەڕووی سوپای گەورەو بەهێزی داریووش ببنەوە. ئەم هۆزانە بەشێوەیەکی رەسەن خەڵکانێکی کۆچەر بوون، زۆر بە ئاسانی دەکشانەوەو وایان لە ئێرانییەکان دەکرد کاتی خۆیان بۆ بەدواداچوون و بە شوێن ئەواندا رۆیشتن، بە فیڕۆبدەن. ئەوکات سوارچاکانی ئێسکیتی هاوکات لەگەڵ ئەم کردە ستراتیژیکییە بە شێوەی چریکی هێرشیان دەکردو هێزە گەڕۆکەکانی ئێرانیان ئازاردەداو ماندوویان دەکردن. هەروەها سیاسەتی لەناوبردنیان پەیڕەو دەکرد. هیرۆدۆت دەڵێت: "پێیان باشتر بوو... لەسەر رێگا بیروکانیاوەکان تێك بدەن و هەموو جۆرە گیاو دەوەنێك کە لەلایەن گیانلەبەرانەوە بەکاردەبردرا لەناو ببەن و خراپ بکەن[٥١]" تاکو بەم جۆرە لێنەگەڕێن هێرشبەران کەڵك لەم سەرچاوانە وەربگرن.

داریووش وەکو سەربازێکی دەورە دیتووی رەسمی و پابەند بە نەریتی سەربازی ئیمپراتۆرییەتەکەی، ئەم شێوازانەی دوژمنی بە پست و ناپیاوانە لە قەڵەم دا و زۆر زوو دڵسارد و بێ هیوا بوو. جا بۆیە پەیامێکی بۆ **"ئیدان تیۆرسووس** Idan Thyrsus" سەرۆکی **ئێسکیت [سەکایی]** نارد، ناوەڕۆکی ئەم پەیامە بەم شێوەیە بوو:

*ئەی پیاوی باش، تاکەی هەڵاتن؟ ئاشکرایە کە دەتوانی دوو رێگا هەڵبژێری. ئەگەر پێت وایە دەتوانی لەگەڵ من بجەنگی لە جیاتی هەڵاتن و سەرگەردانی لە سنووری بەرفراوانی ئەم جیهانە، لە شوێنی خۆت بمێنەوەو هێزو توانای خۆت پیشان بدە، و ئەگەر پێت وایە لەبەرامبەر من بێ توانای، ئەم هەڵاتنە چ سوودێکت پێ دەدا؟ باشتر وایە ئاو و خاك بە هێمای ملکەچبوون و خۆبەدەستەوەدان بۆ سەروەرت بنێری و دانووستانم لەگەڵ بکەی.*

و **تیۆرسووس** سەروەری **سەکاکان** بەم چەشنە وەڵامی داوە:

*ئەی فەرمانڕەوای پارسەکان تۆ سەرت لە شێوەی کاری من دەرناچێ. هەڵاتنی من لەبەر ترس نییەو هەرگیز لە کەس نەترساوم. ئەو شتانەی، کە دەیانکەم نابێ لە دیدی تۆوە چاوەڕواننەکراو بێت. ئەمە بەراستی شێوەو کرداری بەردەوامی ئێمەیە. تەنانەت لە کاتی ئاشتیش ئەمە کارمانە. ئەگەر پێتخۆشە بزانی بۆ ناجەنگم، هۆکارەکەت پێ دەڵێم. ئەگەر ئێمە شار یان کێڵگەیەکمان هەبوایە بێگومان هەر زوو دەجەنگاین، بەڵام ئێمە نە ئەومان هەیەو نە ئەمەیان. ئەگەر لەگەڵ ئەوەشدا مەبەستی خوێنڕشتنت هەیەو لەبەر ئەوە ناتوانی ئارام بگری، ئێمە تەنیا لەبەر شتێك لە جەنگ دوورناکەوینەوە و ئەویش بەرگریکردن لە گۆڕی باب و باپیرانمانە. ئەگەر راست دەکەی ئەم گۆڕانە بدۆزەوە و لەناویان بەرە، ئەوسا بێ هیچ وچانێك بۆت بەدیار دەکەوێ تاکو ئەو ڕۆژە نەبێت ئێمە مەبەستی شەڕمان نییە... ئەمە وەڵامی منە بۆ هەڕەشەکردنەکەی تۆ، کە خۆت بە سەروەری من دەزانی، پێت دەڵێم من جگە لە زیووس [خواوەند] کە گیانی منی لە دەست دایە... سەروەرێکی تر ناناسم و بەناوی پێشکەشی نە ئاوت بۆ دەنێرم نە خاك... جاڕ لێدانی تۆ بۆ سەروەری من وەڵامێکی سادەو رەوانی هەیە: ئەی نەگبەت لە سەرزەمینی ئێمە دووركەوە!*(٥٢)

پێدەچێت ئێرانییەکان گۆڕی سەکاییەکانیان (ئیسکیت) نەدۆزیەوە تاکو خراپیان بکەن، و ئەمەش گاڵتەیەکی سەیر بوو، کە زۆرتر لە چەند هەفتەیەکی خایاند و تێیدا ئێسکیتەکان لە شەڕ و پێکدادان و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێزەکانی داریووش دووردەکەوتنەوە. لە ئەنجامدا تورەیی و بەسەرخۆدا شکانەوەو کەمبوونی خۆراك بوونە هۆکاری لەناوچوون و لاوازبوونی هێزەکانی ئێران، و سەرەنجام داریووش دەستووری دا بەرەو دانووب بگەڕێنەوە. ماوەیەکی زۆر لە تێپەڕینی فەرمانڕەوا لە رووبار تێنەپەڕیبوو، کە هەواڵی یاخیبوونەوەی ئەو هۆزانەی **تەراکییە** راگەیێنرا، کە پێشتر لە بەردەم دەسەڵاتی ئەودا سەریان دانواند بوو. ((**پاشای گەورە**)) بۆ سەرکووتکردنەوەی ئەم یاخیبووانە نزیکەی هەشتا هەزار سەربازی رەوانە کردو زۆر زوو تەراکییەیان گرتەوە. ئینجا بەرەو شاری سارد گەڕاوەو بەرلەوەی بگەڕێتەوە ئێران چەند مانگێك بۆ مەبەستی پشوودان ماوە.



## شۆڕشی ئیوونییە

پێدەچێت داریووش سەرنەکەوتنی خۆی بەسەر سەکاکانی بە پێشهاتێکی کاتی دانابێت، و ئەمەی بە شکست لە قەڵەم نەدابێت و بە شێوەیەکی گشتی ناردنی سوپا بۆ هەرێمی سەکاکانی بەکارێکی باش دانابێت. هەرچۆنێك بێ ناوچەیەکی بەرفراوانی لە تەراکییەی داگیرکردبوو، کە ساتراپی نوێی "**سکوودرا** Skudra" ی تێدا دامەزراو بەم چەشنە پاڵپشتییەکی باشی لە ئەوروپا دامەزراند. بێگومان پێشبینی ئەوەی دەکرد لە داهاتوودا بگەڕێتەوە، ئەگەرچی بەتەواوی دیارنییە بۆ دووبارە هێرشبردنە سەر ئەوروپا چ پلانێکی داڕشتبوو. بەو جۆرەی کە لە پێشهاتەکانی دواتر بەدیار دەکەوێت، یۆنانییەکانی ئیوینییە ئەم بڕیارەیان بەسەردا سەپاند، کە جۆری بیرکردنەوەیان لە بابەت ئەنجامەکانی هێرشکردنە سەر نیشتمانی سەکاکان لەگەڵ تێڕامانی ئەودا جیاوازبوو. (واتا **ئیوینییەکان** پێیان وابوو داریووش لە نیشتمانی **سەکاکاندا** تووشی شکست هاتبوو. و). داریووش لە ماوەی هێرشبردنی پشتی بەو سەربازانەی خۆیەوە بەست، کە لە ئیوینییەدا خزمەتیان دەکرد. فرمانی پێدان تاکو بە کەشتییەکانیان پردێکی بۆ لەسەر رووباری دانووب دروست بکەن و کاتێك کە ئەو لەناو دەشتەکانی ئەوبەر دەجەنگێت ئەم پردە وەك خۆی رابگرن. ئەم سەربازانە پێی وەفادار مانەوە و لەژێر زەخت و فشاری سەکاکانیش ئەم پردەیان خراپ نەکرد. "**جۆن واری** John Warry" زانای کلاسیێك لەم بابەتەوە دەڵێت:

*هەم داریووش و هەم یۆنانییەکانی ئیونییە کۆمەڵە دەرەنجامێکی هەڵەیان دەستکەوت. داریووش پێی وابوو، لە داهاتوودا دەتوانێ پشت بە وەفاداری و پابەندبوونی ئیوونییەکان ببەستێت، و یۆنانییەکانی ئیونییەش پێیان وابوو سەکاکان بەسەر ئێرانییەکاندا سەرکەوتوونە و ئێستاکەش هەلێکی باش رەخساوە تاکو بێ هیچ ترسێك و بەهیوای سەرکەوتن دژ بە فەرمانڕەوا ئێرانییەکانیان بوەستن*(٥٣).

ئیونییەکان ماوەیەکی زۆر بوو خەونیان بە سەربەستی و گەیشتن بە سەربەخۆیی دەبینی. بەڵام بەخت و ئیقبالیان بۆ بەدی هاتنی ئەم خەونە باش نەبوو، چونکە هەروەك جاری جاران نەیانتوانی یەك بگرن و سەرۆکێك بدۆزنەوە تاکو لە کۆت و زنجیری دەیانساڵەی ئیمپراتۆری ئێران دەربازیان بکات. ئەم بارودۆخە لە کۆتاییدا لە ساڵی ٤٩٩ی پێش زایین گۆڕانی بەسەرداهات و سەرکردەیەکی لێهاتوو بەناوی "**ئاریستاگۆراس** Aristagoras" کە هاوڵاتییەکی پایەبەرزی شاری **میلەتووس** [میلێت] بوو لەناو ئەواندا سەری هەڵدا. لەبەر ئەوەی شاری میلێت بەهێزترین و دەوڵەمەندترین شاری ئیونییە بوو، سەلماندی سەرکردەیەکی ڕاستەقینەو شیاوە و بە ئیونییەکانی راسپارد ڕێکخستنە نهێنییەکانیان بەگەڕ بخەن و یەکەمین قۆناغی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ داریووش بەڕێوە ببەن. ئینجا لە سەرتاسەری ئیونییە رابەرانی




یۆنانی لایەنگری ئێران لەسەر کار لادران و شۆڕشگێڕە نیشتمانپەروەرەکان لە شوێنیان دانیشتن. ئاریستاگۆراس زۆر بە باشی دەیزانی یاخیبوونەوەیان وەڵامێکی سەربازی لەلایەن پاشای گەورەوە لێدەکەوێتەوە و دانیشتوانی ئیونییە دەبێ بۆ پاراستنی گیان وماڵیان بجەنگن. کەواتە بۆ بەهێزکردنەوەی هێزەکانی بەخێرایی داوای یارمەتیی لە دەوڵەت- شارەکانی سنووری خاکی یۆنان کرد. لەبەر ئەوەی ئیسپارت لەوانی تر بەهێزتر بوو، وای دەخواست یەکەمین جار داوای یارمەتی لە ئیسپارت بکات. فەرمانڕەوای ئیسپارت بەناوی **"کلیۆمێنێس** Cleomenes" کە بە هۆی بەڵێنەکانی **ئارستیۆگۆراس** بۆ بەدەستهێنانی زێڕو سامانی ئێران و خەزێنەکانی تری شووش پێش چاوی تاریك ببوو، سەرەتا رازی بوو تاکو سەرۆکایەتی سوپای سەربازانی خۆی بۆ هێرشکردنە سەر ئێران بە ئەستۆبگرێ، بەڵام ئاریسترگۆاس تووشی هەڵە بوو و بە فەرمانڕەوای ئیسپارتەکانی گووت؛ کە لە شاری **سارد**ەوە تاکو **شووش** سێ مانگ ڕێیە. ئیسپارتەکان، کە زانیان دەبێ ئەم ڕێگا دوورو درێژە بپێون و لە نیشتمانی خۆیان دوورکەونەوە، پەشیمان بوونەوە و هەروەکو ڕۆژگاری دەسەڵاتداری کورووشی گەورە بەژداری شۆڕشی ئیونییەیان نەکرد.

ئەوسا **ئاریستاگۆراس** هەوڵی دا داوای یارمەتی لە **((ئاتین))** بکات، کە بە ڕابەری ڕۆشنبیریی یۆنانی دادەنراو لە ماوەی یەك دەیە لەمەوبەر لە شارەکەی خۆیدا سیستەمی



دیموکراسی دامەزراند بوو. هەرتاکێکی نێری سەربەستی ئاتینی مافی ئەوەی هەبوو سەربەستانە راوبۆچوونەکانی خۆی دەربڕێ و لە دانیشتنەکانی ئەنجوومەن بەشێوەیەکی ئازاد دەنگ بە یاسا و سیاسەتە نوێکان بدات. لەو هەڵبژاردنانەی، کە هەموو ساڵێك بەڕێوەدەچوو هاوڵاتیانی ئاتینی هەڵدەستان بە هەڵبژادنی سێ **"ئارکۆن"** یان بەڕێوەبەری شار بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت و هەڵبژاردنی دە سەرداری جەنگاوەر کە "Strategoi" یان پێدەگووترا و سەرۆکایەتی سوپای سەربازییان بە ئەستۆبوو. ئاریستاگۆراس داوای یارمەتی لەم **دەوڵەت- شارە** دیموکراتییە کردو بە پێی نووسراوەکانی **هیرۆدۆت** گووتی:

*کۆچەرانی ئاتینی بوون کە (میلت)یان بیناکرد. کەواتە زۆر ئاساییە ئەگەر ئاتین بەو دەسەڵات و هێزەی کە هەیەتی هاوکاری میلت بکات. لە راستیدا لە بابەت یارمەتی ویستن لە ئاتینییەکانەوە ئەوەندە چەنەچەنی کردو خۆی بەولاو بەولادادا و بەڵێنی گەورەی پێدان تاکو سەرەنجام بە ئاواتی خۆی گەیشت. بەڕاستی پێدەچێت ملکەچکردنی کۆمەڵە کەسێك زۆر لە تێگەیاندنی کەسێك ئاسانتر بێت، چونکە ئاریستاگۆراس، کە نەیتوانی بوو کلیۆمێنس رازی بکات، بۆ رازیکردنی سی هەزار کەس تووشی کێشەیەك نەبوو*(٥٤).

## کارەساتی لادە

ئاریستاگۆراس بە دڵخۆشییەوە بەرەو ئیونییە گەڕاوە و ئەم هەواڵە دڵخۆشکەرەشی پێ بوو، ئاتین رازی بووە پشتیوانی لە یاخیبووان بکات. جگە لەمە یەکێك لە هاوپەیمانانی ئاتین واتا شاری **"ئێرێتریا** Eretria" کە دەکەوتە ناو دوورگەی گەورەی **"ئێووبۆئا** Euboea" ی لێوارەکانی کەناری رۆژهەڵاتی یۆنانیش رەزامەندی خۆی پیشاندابوو، تاکو هێزی یارمەتییان بۆ بنێرێ. ئەم کارە لە ساڵی **٤٨٩**ی پێش زایین ئیونییەکانی هان دا و جورئەتی پێدان، بە چەشنێك، کە وایان لە کاربەدەستانی ناوچەیی و فەرمانبەری داریووش کرد لەوێوە بەرەو سارد بۆی دەرچن، و زۆر بە ئاشکرایش ڕووبەڕووی گرووپە بچووکەکانی سەربازی ئێرانیش بوونەوە. تەنانەت یاخیبووان توانیان لەلای باکوورەوە **تەراکییە** داگیر بکەن و لە ئەنجامی ئەمەوە یۆنانییەکانی ئەم ناوچەیەش لە ژێر فەرمانی ئیمپراتۆرییەتی ئێران دەرباز بوون.



**ئاكرۆپۆلیس بینای شكۆداری ئاتین، و دیمەنێكی پارتێنۆنی بەناوبانگ كە پەرستگەی خواوەندەكانی یۆنانییە. لەپاش جەنگی ئێران و یۆنان ئەم شوێنانە نۆژەنكرانەوە.**

یاخیبووان دوای گەیشتنی بیست كەشتی لە ئاتینەوەو پێنج كەشتی تریش پڕ لە خۆراك و سەرباز لە ئێریتێریا، جورئەتێكی زۆرتریان وەرگرت، كارەكەیان لە باوەڕ پێبوونێكی سادەی بچووك زیاتری گرتەوە. بەشێكی كەمی هێرشبەرانی **میلتی** و **ئاتینی** بە سەرۆكایەتی **ئاریستاگۆراس** چوونە سارد و لەماوەی پێنج خولەكدا شار ئاگری تێبەردرا. ئەمەش هۆشدارییەك بوو بۆ ئەو پێگە سەربازییە گەورەیەی كە لەو نزیكانە هەڵكەوتبوو. هێزەكانی ئەم پێگە سەربازییە هێرشبەرانیان تاساندو دژە هێرشێكی كتوپڕیان كردنەسەر. یۆنانییەكان، كە ئامادەیی جەنگێكی بەرفراوانیان نەبوو بەرەو دواوە كشانەوە. بەڵام هەڵاتنەكەیان دەربازی نەكردن، چونكە سەربازەكانی ئێران بەدوایان كەوتن و بەرەو گۆشەیەك لە نزیك كەناری دەریا راپێچ كران و پاش جەنگ و پێكدادانێكی توند بە سەریان دا سەركەوتن. لە كاتێكدا پاشماوەی سوپای میلتیەكان بەرەو شاری خۆیان گەڕانەوە، سەركردەكانی ئاتینی و ئێرێتریایش باشترین چارەیان لەوەدا دی، كە بەرەو یۆنان بگەڕێنەوە. بەم چەشنە لەگەڵ ئەوەشدا كە دانیشتوانی رەسەنی یۆنان بەوپەڕی سۆزو خۆشەویستییەوە ئاریستاگۆراسیان بانگەشەی مانەوە لەوێدا دەكرد، ئەوان ئێونییەیان بەجێهێشت تاكو لەسەر جەنگ و ئامانجەكانیان بەردەوام بن.



بەڵام ئەگەر ئاتین و ئێرێتریا وایاندەزانی هەڵاتن و دووركەوتنەوە لە جەنگ لەم قۆناغەدا رێگە لە هەڕەشەی تۆڵەسەندنەوەی داریووش دەگرێت، لە هەڵەدابوون. داریووش فەرمانڕەوایەكی لە خۆبایی و بەتوانا بوو، كە چەندین جار تواناییەكانی خۆی بۆ سەركوتكردنی شۆڕشەكان و سزادانی ئەو كەسانەی، كە نافرمانیان كردبوو یان ئیهانەیان كردبوو، سەلماندبوو. ئاشكرابوو یاخیبوانی ئیونی لە فرمانی ئەو دەرچوو بوون و یۆنانیش هاوبەشی ئەم تاوانەیان ببوو و بەدەستتێوەردان لە كاروباری ناوخۆی ئیمپراتۆری ئیهانەی پێكردبوو. سووتاندنی سارد ئیمپراتۆری تووڕەكرد و سوێندی خوارد، كە لە یەكەم هەنگاودا یاخیبووەكان سەركووت بكات و دوایی ئاتێنییەكان و ئێرێترياییەكانی تازە پەیدابوو، سزابدات.

**هیرۆدۆت راپۆرت دەدات ((شای گەورە)):**

*پرسی ئاتینییەكان چ جۆرە كەسانێكن و هەركە باسی ئەوانی بیست، فرمانی دا تیرو كەوانەكەی بۆ بێنن و تیرێكی خستە سەر كەوان و بەرەو ئاسمان پێكاندی و بەدەنگێكی بەرز گووتی: "خواوەندا یارمەتیم بدە تاكو ئاتنییەكان بە سزای خۆیان بگەینم" و بە یەكێك لە سەرپەرشتیارانی خوانی فەرمانڕەوایی راسپارد، هەركاتێك كە فەرمانڕەوا لەسەر خوانی خواردن دانیشت سێ جار ئەم رستەیە دووبارە بكاتەوە: "ئەی فەرمانڕەوا ئاتینییەكانت لە بیر نەچێ.*[٥٥]*"*

داریووش بۆ ماوەی چوار ساڵ پابەندی ئەو سوێندە بوو كە خواردبووی. وردە وردە، بەڵام بەشێوەیەكی بیرمەندانە دەستی بەسەر شارەكانی ئیونییە داگرت و خستییە ژێر دەسەڵاتی خۆی. توانایی ستراتیژیكی ئەو هێزە دەریاییەی كە كەمبووجییەی ئیمپراتۆری پێش داریووش نزیكەی سێ دەیە بەرلەوە دایمەزراندبوو، ئێستا لەسەر دەستی ئێرانییەكان بەهێزتربووە. هێزی دەریایی ئێران توانی دەستبەسەر رۆژهەڵاتی دەریای ئیژە دابگرێت. یاخیبووەكان لەنێوان دەریاو هێزەكانی سوپای زەمینی داریووش دەست بەسەر كران. لە ساڵی ٤٩٤ی پێش زایین یاخیبووان دوایین هەوڵی بێ هیوایانەی خۆیان لە جەنگێكی دەریایی گەورە لە نزیك دوورگەی بچووكی "لادە Lada" كە زۆر لە شاری میلێت دوور نەبوو، خستەگەڕ. بەڵام ناكۆكی و دژایەتی بەردەوامیان جارێكی تر دەوری خۆی بینی و هەوڵەكەیان كارەساتێكی تری لێكەوتەوە، هەندێ لە كەشتییەكانی یاخیبووان رێك دوای دەستپێكردنی جەنگ هەڵاتن و ئەوانی تریش، كە ئەمانەیان دەبینی بە دوایانەوە هەڵاتن، چەند كەشتییەك بەتایبەت كەشتییەكانی میلێتی و دوورگەكانی خیووس و سامووس مابوونەوەو بوێرانە دەجەنگان، بەڵام

گرفتەکانیان زۆر بوو. چانسی سەرکەوتنیان کەمبوو و بەناچاری تووشی شکستێکی قورس هاتن[٥٦].

شاری **میلێت** بەتەواوی لە بەرامبەر هێزەکانی داریووش بێ کەس مابۆوە. **هیرۆدۆت** بەم جۆرە وەسفی ڕەفتاری ئێرانییەکان لە پاش سەرکەوتنەکەیان دەکات:

*[ئێرانییەکان]... لە ڕێگەی دەریا و وشکاییەوە (میلێت)یان گەمارۆدا و لەژێر دیوارەکان تونێلێکیان هەڵکەند، ئامێری ئاگرپژێنیان بەکاربردو پێنج ساڵ دوای دەستپێکی شۆڕشی ئاریستاگۆراس، سەرجەم شار و هەروەها قەڵای ناوەندیان داگیرکرد... زۆربەی خەڵکی [میلێت] بە دەستی دوژمنی سەرکەوتوو، سەرکوت کران... ژنان و منداڵەکانیان بەدیل گیران... ئەو کەسانەی کە نەمردبوون، وەکو دیل بەرەو شووش بەڕێ کران. داریووش ئەمانەی ئازار نەدا و لە لێواری کەنداوی فارس لەسەر ڕووباری **دیجلە** لە شوێنێك بەناوی "ئامپێ **Ampe**" شوێنێکی بۆ نیشتەجێبوون پێدان[٥٧].*

لە مانگەکانی دوایی شارەکانی تریش کەوتنەبەر شەپۆلی تووڕەیی داریووشەوە. لە دوورگە یاخیبووەکانی وەکو **خیووس** و **سەبووس** هەزاران سەربازی ئێرانی لە پاڵ یەکەوە کەنار بە کەنار پێشڕەویان کرد و بەلایەنی کەم زۆربەی ئەم خەڵکانەیان بەدیل گرت، زۆربەی شارەکان سووتان و ژمارەیەکی نادیاری منداڵانی یۆنانی بەرەو شووش و ناوەندەکانی تری ئێران ڕەوانەکران. کوڕەکان لەناو دیوانی ئیمپراتۆری خرانە ریزی خزمەتکاران و نۆکەران و کچەکان برانە حەرەمسەرای پاشا. ڕەفتاری توندی داریووش لەگەڵ ئیونییەکان بە ئاشکرایی پیشانی دەدا بۆ ئەو مەبەستەبوو تاکو جارێکی تر هیچ شۆڕشێکی تر لەم ناوچەیە ڕوونەدات.

## ڕووخانی ئێرێتریا

سەرکوتکردنی **ئیونییە** گڕی ئاگری تۆڵەسەندنەوەی شای گەورەی بەتەواوی سارد نەکردبۆوە. هێشتاش **ئاتینی** و **ئێرێتریاییە** لاسارەکان مابوون، کە دەبوایە سزا بدرێن. بۆ ئەم مەبەستە داریووش "**ماردۆنیوو** Mardonius"ی ڕەسەنزادە و مێردی "**ئارتۆزۆسترا** Artozostre" ی کچی بۆ سەرۆکایەتی سوپایەك هەڵبژارد. **ماردۆنیوو** لە ساڵی **٤٩٣** پێش زایین سەرکردایەتی سوپای ئێران لە ئاسیای بچووك و تەراکییەی بە ئەستۆ گرت، لە کاتێکدا کە هێزی دەریایی مەزنی ئێرانیش بەدرێژایی کەنارەکانی ئیژە بۆ یارمەتی و دابینکردنی ئەم سوپا سەربازییە بەڕێکەوت. یەکەمین فرمانی ماردۆنیوو گرتنی تەراکییە بوو، کە بە ئاسانی لە ماوەی چەند



مانگێکدا جێبەجێ کرا. ئینجا فرمانی دا تاکو سوپاکەی بەرەو باشوور بە درێژایی کەنارە ئاوییەکانی یۆنان بەڕێکەوێت و بۆ مەبەستی تۆڵەسەندنەوە لە **ئاتین** و **ئێرێتریا** کە لە شۆڕشی **ئیونییە** دەورێکی کارایان هەبوو، بسووتێنرێ و بە تالآن ببردرێ. ئەمە هاوکات شوێنێکی دیاری بۆ ستراتیژیتییەتی ئێران لە باشووری یۆنان بەدی هێنا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پلانە سەرکەوتوو نەبوو، چونکە تۆفانێکی چاوەڕواننەکراو هێزی دەریایی ئێرانی لە نزیك کەپکی ئاتووس، کە دەکەوێتە نیمچە دوورگەی ئاتووس، تێکشکاند. بەپێی راپۆرتی **هیرۆدۆت**:

*بەرلەوەی لە لێواری کاناڵەوە تێپەڕن تووشی تۆفانی بەهێزی باکووری بوون کە توانای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم دیاردە سروشتییەیان نەبوو. زۆربەی کەشتییەکان بەرەو وشکایی ڕاپێچکران و تێکشکێنران. بە پێی ئامارەکان سێ سەد کەشتی تێکشکان و زیاتر لە بیست هەزار کەس کوژران. ئاوەکانی سەر سنووری ئاتووس پڕ لە گیانلەبەری پیاو خۆرە، بەم جۆرە ئەو کەسانەی کە زیندوو مابوونەوە، بوونە خۆراکی ئەم گیانلەبەرانەو ئەو ژمارە زۆرەی، کە مەلەوانیان نەدەزانی نقووم و زۆربەشیان بە هۆی سەختی سەرما لەناوچوون.*

سوپای زەمینی ئێران بێ پشتیوانی هێزی دەریایی نەیدەتوانی ماوەیەکی زۆر خۆی ڕابگرێ و داریووش بە ناچاری ماردۆنیوو و هێزەکانی بانگ کردەوە.

بەڵام یۆنانییەکان نەیانتوانی لە تووڕەیی شای گەورە، خۆیان دوور ڕاگرن. چونکە بەخێرایی خۆی بۆ هێرشێکی تر ئامادە کرد. ئەمجارەیان ئەرکی سەرۆکایەتی سوپاکەی خستە ئەستۆی "**داتیس** Datis" ی مادی و "**ئارتافرێنی** Artaphernes" ی برازای. بە پێی پلانی نوێ نابێ زۆر دوابکەون و هێزە کۆماندۆییەکانی دەریایی دەبوایە ڕاستەوخۆ لە ئیژەوە تێپەڕن و بەسەر شارە دەستنیشانکراوەکان دابدەن. **داتیس** و **ئارتافرێن** لە بەهاری ساڵی ٤٩٠ی پێش زایین گەیشتنە **کلیکیای** باشووری ئاسیای بچووك و چاودێری بارلێنانی سەدان کەشتی و گواستنەوە و گەیاندنی سوپاکانیان کرد. بەشێوەیەکی گشتی هێزە سەربازییەکان **٦٥** هەزار کەس بوون، پێدەچێت بیست هەزار کەسیان مەلەوان و ڕاسپێردراوی جوگرافیناس و ئەوانی تر سەربازانی مەیدانی جەنگ بووبن. کاتێك کە هێزەکانی دەریایی ئامادەبوون بەدرێژایی کەناری ئاو بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێکەوتن و لە باکووری دوورگەی گەورەی **ڕودۆس** تێپەڕین و بەرەو باکووری ڕۆژئاوا بۆ **سامۆس** سووڕانەوە. لە دەریا تێپەڕین و گەیشتنە دوورگەی **ناکسۆس** و لەوێدا ئێرانییەکان شاری سەرەکییان ئاگر تێبەرداو لە کۆتاییدا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا بۆ مەبەستی گەیشتنە **ئێرێتریا** بەڕێکەوتن.

بە نزيك كەوتنەوەی ئێرانییەکان، خەڵکی ناوچەکانی دەوروپشتی دیوارەکانی بەرگری ئێرێتریا کۆبوونەوەو سەنگەریان گرت. کاتێك سەربازانی داتیس و ئارتافێرێن بە جل و بەرگی ئەرخەوانی و سووری شارەکەیان گەمارۆدا، یۆنانییەکان بە ترسەوە تەماشایان دەکرد. هێرۆدۆت دەڵێت: "لە ماوەی شەش رۆژ جەنگ بەردەوام بوو، کە ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی هەردوو بەرەی جەنگ کوژران. سەرەنجام لە رۆژی حەوتەمی جەنگ دوو پیاوی بەناوبانگی ئێرێتریایی... شارەکەیان بە دوژمن فرۆشتەوە[٥٩]". ئەم دوو پیاوە سەر بە ریزی ئەو دیموکراتانە بوون، کە ماوەیەك لەمەوبەر لەگەڵ ئەندامانی پارتی توندڕەو تووشی ناکۆکی ببوون و وایاندەزانی ئێرانییەکان لە بری ئەم کارە باشەی ئەوان دەسەڵات و هێزی ئەم ناوچەیەیان پێدەدەن. بەڵام ئەوانە تووشی هەڵەیەکی گەورە ببوون. هێرشبەران شارەکەیان سووتاند و پاشماوەی دانیشتووانی شارەکەیان بەدیل گرت[٦٠].

## جەنگ و پێکدادان لە ماراتۆن

داتیس و ئارتافێرێن بە لەناوبردنی ئێرێتریا نیوەی ئەرکی خۆیانیان جێبەجێ کردبوو. ئەوان دڵنیابوون ئامانجی دووەمیان- گرتنی ئاتین- بەم ئاسانییە دەبێت. لە سەرەتای سێپتامبەر (نیوەی خەرمانان) لە **ئووبوویاوە** بەڕێکەوتن و پاش ماوەیەکی کەم گەیشتنە **"ئاتیکا** Attica"ی کەنارە ئاوییەکانی هەرێمی ئاتین و لە دەوروبەری رۆژهەڵاتی دەشتی بەرفراوانی ماراتۆن خێوەتگای سەربازییان هەڵکرد. پێدەچێت پلانە سەرەتاییەکەیان ئەوەبوو، کە لە وشکاییەوە بەرەو ئاتین بەڕێکەون و لەمەودای نزیکەی٤٠ کیلۆمەتری دەست بکەن بە تاڵان کردنی شارو دامەزراندنی پێگەیەکی ئێرانی لە ئاتیکا.

بەڵام سەرکردە سەربازییە ئێرانییەکان بەوپەڕی سەرسوورمانەوە بینیان کێشەیەکیان لەبەردەم سازبووە. میلیشیاکانی ئاتینی، کە نزیکەی نۆ هەزار **هووپۆلیت** [سەربازانی پیادەی چەك قورس] دەبوون و هەروەها لەلایەن شەش سەد چەکداری سەربە **دەوڵەت — شاری** بچووکی **پلاتێ** Plataea وە پشتگیرییان لێدەکرا، لە سنووری باکووری **ئاتیکا** سەقامگیر بوونەو لە دەورووبەری رۆژئاوای دەشت ریزبوونە و رێگەی ئایتنیان گرتووە. هووپۆلیتەکانی یۆنانی لە کۆمەڵە سەربازێکی چەك قورس پێکهاتبوون و رمیتیژ و بچووکیان پێ بوو. ئەو سەربازانە لەناو کۆمەڵە یەکەیەکی سەربازی تایبەتدا دەجەنگان کە "**فالانکێس** Phalanx" یان [**فالانژ**]یان پێدەگووت. کە لە سەرەتای سەدەی حەوتەم و هەشتەمی پێش زایین لە نیشتمانی سەرەکی یۆنان دامەزرابوو و گەشەی کردبوو. یەکەیەکی فالانکێس لە هەشت ریز یان پۆل هووپۆلیت پێکدەهات. کاتێك ئەم



ریزە ریك و پێکانە پێکەوە دەلکان و بە چڕی قەڵغانەکانیان بە رێکی لە تەك یەکتری بەرزدەکردەوە، بەربەستێکی پتەوی لێکنەترازاویان بەدی دێنا. کاتێك ئەم هێزە سوپاییانە هێرشیان دەکردە سەر دوژمن، پیاوانی ریزی پشتەوە بەتوندی پاڵیان بە پیاوانی ریزی یەکەمەوە دەنا و ئەوانیش رمە درێژەکانی خۆیانیان دەئاخنییە ناو لەشی دوژمنان و لەناویان دەبردن.

بەڵام فالانژەکانی یۆنانی لە جەنگی سەخت و گەورەدا بەرادەی سەربازەکانی ئێران کارامەو بەئەزموون نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەکانی سوپای ئێران داتیس و ئارتافێرێن زانیارییەکی ئەوتۆیان نەبوو لە بابەت تواناییەکانی ئەم سوپا بچووکەی کە رووبەڕووی ببوونەوە. بێگومان کاتێك یۆنانییەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە ژمارەیان کەم بوو، بوێرانە لە بەرەبەیانی رۆژی دوازدەی سێپتامبەر هێرشیان کردە سەر ریزەکانی سوپای ئێران و سەردارانی ئێران سەرسام بوون. **هێرۆدۆت** دەنووسێت:

*یۆنانییەکان کە خۆیان بەباشی ئامادەکردبوو لە دوولاوە هێرشیان کرد، ئێرانییەکان پێیانوابوو ئەمە هێرشێکی خۆکوژانەیە... چونکە ئاتینییەکان بەهێزێکی کەم و بێ پاڵپشتی سەربازانی سوارچاك و تیرهاوێژ پێشڕەویان کرد و دەستیان بە شەڕکرد[٦١].*



**هووپۆلیتەکانی ئاتینی و پلاتەیی لە دواین ساتەکانی جەنگی ماراتۆندا وا لە ئێرانییەکان دەکەن بەرەو کەنارەکانی دەریا پاشەکشێ بکەن. بەپێی راپۆرتی هێرۆدۆت، کالیماکووس، ئارکۆنی جەنگاوەری یۆنان و برای "ئاسیکیلووس" ی شانۆنامەنووسی ناودار لەم جەنگەدا کوژران.**

ئەوسا لەو جەنگە خوێناوییەی کە روویدا، **هووپڵیتەکانی** یۆنانی و **فالانکێسەکانیان** رێك و پێکتر و بەتوانا تر لە هەزاران سەربازی ئێرانی خۆیان نواندو لە ئەنجامدا ئێرانییەکان بە شڵەژاوی بەرەو کەناری دەریا رایانکرد. یۆنانییەکان بەدوایان کەوتن و دوای هەڵاتنی هێزی دەریایی دەستیان بەسەر حەوت کەشتی داگرت. داتیس و ئارتافێرنێ زیاتر لە ٦٤٠٠ سەربازیان لە دەستدا (لە بەرامبەر ئەمە تەنیا ١٩٢ ئاتینی کوژران) و سەرەنجام وازیان لەو ئەرکە سەربازییە هێنا، کە پێیان سپێردرابوو و بەرەو ئاسیای بچووك گەڕانەوە. ئینجا نێردراوێکیان رەوانەی لای داریووش کرد تاکو ئەم هەواڵە ناخۆشە بەداریووش رابگەینن. هاوکات داوای لێبوردنیشیان کردبوو.

لە پاش کشانەوەی ئێرانییەکان، یۆنانییەکان بە چەندین جۆر ئاهەنگ و خۆشی، ئەم سەرکەوتنەیان پیرۆز راگرت. بە چەشنێك، کە دواتر ئەم سەرکەوتنە لە ئەدەبیات و فولکلۆری شارنشینی رۆژئاوا کرایە ئەفسانە، چونکە ئەم سەرکەوتنە دەستکەوتێکی داستانی و قارەمانییەتی بۆ ئەوان بوو. بە پێچەوانەوە لە روانگەی ئێرانییەکانەوە شکستی ماراتۆن جگە لە زیانکەوتنەوەیەکی بچووك لە هێزی بەتوانا و نەبەزی ئیمپراتۆرییەکەیان بە شتێکی وا بایەخدار دانەدەنرا. ئەگەرچی ئێرانییەکان لەلایەن یۆنانییەکان بە وشەی ناشرینی وەکو ( **بێ سەرووبەر**) ، ( **پەست** ) و ( **لاسار** ) ئیهانە دەکران، بوێرانە و بێ هیچ جۆرە ترسانێك پاش ماوەیەکی کەم بەرەو ئەو کەنارە ئاوییانە گەڕانەوە، کە بەجێیان هێشتبوون. بەڵام ئەمجارەیان بە هێزێکی یەکجار زۆر و لەشکرێکی زۆر گەورەوە.



## جەنگی ماراتۆن

ئەم خشتەیە بەوێنەکێشانەوەی قۆناغەکانی جەنگە، بە پێی ئەو راپۆرتە مێژووییانەوە رێکخراوە کە لەلایەن کەسانێکی وەکو هیرۆدۆت و لێکۆڵینەوەی شوێنەوارناسان پێشکەش کراوە







١- هێزی زەمینی ئێران لە ماراتۆن لە سەرەتای سیپتامبەری ساڵی ٤٩٠ی پێش زاین لەم ناوچەیە سەقامگیربوون و لە نزیکترین جادەی سەر رێگەی ئاتین خێوەتەکانیان دامەزراند. یۆنانییەکان بەرزاییەکانی دەوروپشتی جادەیان گرت و بەرەبەیانی دوازدەی سیپتەمبەر بەرەو دەشت دابەزین، کە یەك میل لە ریزی سەربازانی ئێران دووربوون و خۆیان بۆ هێرشکردنە سەر ئێرانییەکان ئامادەکردبوو.



٢- سەرداری گەورەی ئاتینی میلتادێس Miltiades فالانکێسی خۆی بەرەو درێژایی هێڵی سوپای ئێران جێگیرکرد تاکو پێش ئەگەری هێرشی دوژمن بگرێت. بۆ ئەم کارە ناوەندی هێڵەکانی سەربازی خۆی لە هەشت تاکو دە ریز کەم کردەوە بۆ دوو تاکو چوار ریز. پلاتەییەکان لە لای چەپ سەنگەریان گرتبوو. یۆنانییەکان ئەوەندە چوونە پێشەوە تاکو کەوتنەبەر رەسەدی تیرهاوێژانی ئێرانی، ئینجا دوایی دەستیان بە هێرشکردن کردو بە هێزێکی وێرانکەرو بەتوانا ریزەکانی سوپای سەربازی ئێرانیان کەل و کۆم کرد.



٣- کاتێك کە شەڕ گەرم بوو، ڕیزەکانی بەرەی جەنگی ئێرانییەکان هەوڵیان دا دزەبکەنە ناو ناوەندی لاوازی سوپای یۆنانی. بەڵام لەم کاتەدا باڵەکانی یۆنانی، دوژمنەکانی خۆیانیان شکست داو ئینجا دەستیان بە سووڕانەوە بەرەو ناوەوە کرد و ناوەندی سوپای دوژمنیان گەمارۆداو ترس و لەرزێکی زۆریان لەناو ئێرانییەکان بەدی هێنا.



٤- زۆربەی ئێرانییەکان بە پەریشانی و شڵەژاوی لە مەیدانی جەنگ رایان کرد. هەندێ بەرەو کەشتییەکان کشانەوە. هەندێکی تر پەنایان بردە بەرە ئەو زڵکاوەی، کە دەکەوتە پشتەوەی سەربازگەکە. یۆنانییەکان کە سەربازانی ئێرانییان گەمارۆدابوو هەوڵیان دەدا تاکو هەموویان بکوژن و لەناویان ببەن.



٥- یۆنانییەکان بەدوای دوژمنە هەڵاتووەکان کەوتن. جەنگ لە زڵکاو و کەناری دەریا بەردەوامبوو. لەم ناوەدا "کالیماکووس Calimachus" ئارکۆنی جەنگی یۆنان کوژرا. ئەو ئێرانییانەی کە مابوونەوە بەرەو کەشتییەکانیان پاشەکشەیان کرد، لەئاکامدا یۆنانییەکان توانیان دەست بەسەر حەوت کەشتی دا بگرن.

## (٦)

## توانایيەکی گەورەی بە ئاکام نەگەیشتوو
## خەشایارشا رووبەڕووی یۆنانییەکان دەبێتەوە

ئەو کەسەی کە فەرمانڕەوای زۆربەی جیهانی ناسراوی ئەوسابوو، لە شاری دووری **شووش** بێ ئەوەی یۆنانییەکان ئاگایان لێ بێت، سەرقاڵی دانانی پلانێکی تازە دژ بەوان بوو. **هیرۆدۆت** دەڵێت:

*کاتێك کە هەواڵی جەنگی ماراتۆن گەیشتە داریووشی فەرمانڕەوای ئێران، بە یەکجاری تووڕە بوو، چونکە ئاگری ئەو تووڕەییەی، کە بە هۆی هێرشی ئیونییەکان بۆ سارد دروست ببوو، ساردنەببۆوە. جابۆیە بە شێوەیەکی جدی بڕیاری ناردنی سوپای سەربازی بۆ یۆنانی دەرکرد. کەواتە بەخێرایی کۆمەڵە راسپێردراوێکی بۆ سەرتاسەری ناوچەکانی سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆی نارد و فرمانی دا ئەمجارەیان زۆرتر لە جاران سەرباز، پێداویستییەکانی هێزی دەریایی، ئەسپ، ئامێری گواستنەوەی کەلوپەل و هەروەها کەلوپەلی سەربازی ڕەوانە بکەن. بەم چەشنە فرمانی ئیمپراتۆر تاکو دوورترین ناوچەکانی ئیمپراتۆری رۆیشت و یۆنان وەك ئامانج دەستنیشان کرا. لێهاتووترین کەسەکان بۆ کاروباری جەنگی بانگەشەکران و دابینکردنی کەلوپەلی پێویست وردە وردە تەواوبوو و بە درێژایی سێ ساڵی تەواو سەرتاسەری کیشوەری ئاسیا لەناو ورووژان و گەرمای جەنگ دابوو*(٦٢).

بەڵام چاوەڕوانی ئەوە نەدەکرا داریووش بتوانێ تۆڵەی خۆی لە ئاتین و ئێرێتریا بکاتەوە و سنووری ئیمراتۆرییەتی خۆی بگەیێنێتە ئەوپەڕی ناوچە نەناسراوو شاخاوییەکانی ئەورووپا. داریووش لە ساڵی ٤٨٦ی پێش زاین دوای ٣٦ ساڵ فەرمانڕەوایەتی کۆچی دوایی کرد. داریووش بەر لە مردنی جێنشینی خۆی دەستنیشان کردبوو و ئەمەش دەورێکی گرنگی لە بەردەوامبوونی ئیمپراتۆرییەتەکەی دا هەبوو. لە ژنی یەکەمی خۆی، کە کچی یەکێك لەو سەردارانە بوو کە لەکاتی لەناوبردنی **بەردیای درۆیین** لەگەڵی دابوو، سێ کوڕی هەبوو. لە ژنی دووەمی کە ناوی **"ئاتۆسا** Atossa" و کچی **کورووشی** گەورە بوو، چوار کوڕی هەبوو. لەناو ئەم دوو ژنە **ئاتۆسا** دەورێکی زۆرتر و کاریگەرییەکی زۆرتری لەسەر پاشاو دیوانی





**خەشایارشا لە پاش داریووشی باوکی دەبێتە ئیمپراتۆری ئێران. بەپێی زۆربەی راپۆرتە دێرینەکان، ئەگەرچی فەرمانڕەوایەکی بەتوانا بوو، بەڵام لە بەڕێوەبردن و کارزانیدا نەدەگەیشتەوە باوکی.**

فەرمانڕەوایەتی ئەودا هەبوو. لەم رووەوە گەورەترین کوڕی ئاتۆسا بە ناوی **خەشایار** بە جێنشینی و میراتگری تاج و تەختی ئیمپراتۆری دەستنیشان کرا.

لەسەر یەکێك لەو نووسراوە بەردینانەی کە لە **تەختی جەمشید** دۆزراوەتەوە، ئەم دەقە بەرچاودەکەوێت:

*"داریووش کوڕی تریشی هەبوو، [بەڵام] بەو جۆرەی کە خواستی ئاهوورامەزدا بوو، داریووش کە باوکی من [بوو] دوای خۆی منی کردە گەورەترین. کاتێك باوکم تەختی بەجێهێشت [مرد] بەپێی خواستی ئاهوورامەزدا من لە شوێنی باوکم بوومە فەرمانڕەوا.*(٦٤)"

خەشایارشا لە سەرەتا زۆری پێخۆش نەبوو لەسەر پلانەکانی ئەورووپایی باوکی بەردەوام بێت، بەڵام هەندێ لە راوێژکارانی کاریان تێکرد. بۆ نموونە مەردوونییەی مێردی خوشکی بڕوای وابوو ئاتنییەکان نابێ هەرئاوا بەبێ سزادان بمێننەوە و هەروەها دەیگووت ئەورووپا نیشتمانێکی

جوان و دڵگرو بە پیتە، کە بە کەڵك ئێرانییەکان دێت. ئینجا فەرمانڕەواش هەستی بزوا و بە پەیڕەوانەکەی گووت:

*... ڕێگەیەکم دۆزیوەتەوە کە نەتەنیا سەرفیرازی و شانازی بۆ ئێران دێنێتە ئاراوە، بەڵکوو کۆمەڵە وڵاتێکی بەرفراوان و زۆر بە پیت و لە ڕاستیدا دەوڵەمەندتر لە وڵاتی ئێمە دەخرێتە سەر سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەمان. من بەو کارەم جگە لە ئاسوودەکردنی بیرو هۆش، تۆڵەش دەستێنمەوە... لەسەر داردانێل پردێك دروست دەکەم و لە ڕێگەی ئەورووپاوە سوپا سەربازییەکان بەرەو یۆنان بە ڕێدەکەم و بە هۆی ئەو ڕەفتارە نەشیاوەی، کە ئاتین لەگەڵ باوکم و ئێمەی کرد دەبێ سزابدرێ... سنووری ئیمپراتۆرییەتی ئێران تاکو شوێنێك هەڵدەکشێت کە ئاسمانی شین دوایین سنوورەکەیەتی. بە پاڵپشتی ئێوە سەرتاسەری ئەورووپا دەخەمە ژێر پێی ئەسپەکانم و ئەم کیشورە دەکەمە نیشتمانێکی یەکگرتوو تاکو هەرگیز ڕۆژ لە سنووری ئێمە ئاوانەبێت*(٦٤)...

بەم چەشنە خەشایارشا سەرەنجام بڕیاری دا لەسەر پلانی سەربازی باوکی بەردەوام بێت و سوپایەکی گەورەی زەمینی و دەریایی دژ بە یۆنان پێك بێنێت. بە چەشنێك لە ڕووداوەکانی داهاتوودا بەدیارکەوت هەوڵ و تێکۆشانی ئەم فەرمانڕەوایە زۆر بە باشی کاریگەری بەسەر ئایندەی ئەورووپا و ئێراندا هەبوو، ئەگەر چی ئەم کاریگەرییە ئەوە نەبوو کە پاشای گەورە دەیویست.

### سەرکردەیەکی بەتوانای سەربازی

لەگەڵ ئەوەشدا خەشایارشا خەونی بە گرتنی ئەورووپاوە دەبینی، کۆمەڵە کێشەیەك لەناو ئیمپراتۆرییەتی ئێران هاتە ئاراوە، کە وایلێکرد پلانی سەربازی دژ بە یۆنان بۆ ماوەی چەند ساڵێك دوابخات. چەند ساڵێك بەر لە مەرگی داریووش میسر یاخی ببۆوە، و ئەو شتەی کە بۆ فەرمانڕەوا لە ریزی یەکەمی ئامانجەکان دابوو، گەڕاندنەوەی دووبارەی ئەم هەرێمە پڕ بایەخە بۆ ناو دەسەڵاتی ئیمپراتۆری بوو. خەشایارشا ئەم پلانەی لە ژانڤیە (بەفرانبار) ی ساڵی ٤٨٤ی پێش زایین جێبەجێکرد. هەروەها بۆ ئەوەی پیشان بدات ئێران هەرگیز ئەو جۆرە یاخیبوونانە پەسند ناکات. دەستبەسەر زۆربەی ئەو زەوییانە داگیرا، کە تایبەت بە پەرستگە ڕەسەنەکانی ناوچەیی بوون و سزایەکی زۆر توندی بۆ یاخیبووان و خەڵکی ناوچەکە دانا. هەروەها **"هەخامەنیش** Achaemenes"ی برای بۆ بەڕێوەبردنی ساتراپی نوێی میسر هەڵبژارد، چونکە متمانەی بەو برایەی هەبوو.



زۆر بەسەر ئەم ڕووداوە تێنەپەڕی بوو، کە دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی دووبارە بۆ سەرکووتکردنی شۆڕشێکی تر بانگەشەکرا، ئەمجارەیان بابل یاخیبۆوە. لە ساڵی **٤٨٣**ی پێش زایین پاشای گەورە لە **ئیکباتان** بوو، کە هەواڵی پێگەیشت لە **بابل "زۆپریاس** Zopryas" ی ساتراپی بابلیان کوشتووە و پیاوێك بە ناوی **"شاماشێریبا** Shamasheriba" جاڕی ((فەرمانڕەوایەتی بابل)) ی لێداوە. لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی ئەم شۆڕشە زۆر کورت بوو. **خەشایارشا** بەتواناترین سەرداری خۆی بەناوی **"مێگابیز** Megabyzus" ی ڕەوانەکرد. ئەم سەردارە بەخێرایی دووبارە شاری بابلی گرتەوە و بە پێی فرمانی فەرمانڕەوا سزایەکی توندی بەسەردا سەپاندن. دیوار و شوورە شکۆدارەکانی لای دەرەوەی بابلی خاپوور کران. پەرستگەو پەیکەری خواوەندانی ناوچەیی لەناوبردران و دەستبەسەر سەروەت و سامانی هاوڵاتیان داگیراو درایە دەستی ئەو ئێرانییانەی کە لە بابلدا نیشتەجێبوون.

کاردانەوەی خەشایارشا لە بەرامبەر ئەم دوو شۆڕشە سەلماندی کە فەرماندەیەکی سەربازی بەتوانایە، ڕێگە بە هیچ جۆرە یاخیبوونێك نادات و وەڵامی هەمموو جۆرە دەستدرێژی و نافرمانییەك دەداتەوە. سیفەتێکی باشی تری ئەم فەرمانڕەوایە ئەوەبوو، کە وەکو باوکی بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی جەنگی کەسێکی تێکۆشەر و لەسەرەخۆ بوو. دابینکردنی پێداویستی جەنگی بۆ هێرشکردنە سەر یۆنان پیشاندەری ئەم سیفەتەیەتی. بەر لە گەیشتنی هێزەکانی سەربازی، ئەندازیاران و کرێکاران دەستیان بە دروستکردنی پردێکی گەورەی مەلەوان لەسەر **هێلسپۆنت [داردانێل]** کرد تاکو بۆ تێپەڕینی فەرمانڕەوا بۆ ئەورووپا ئاسانکاری بنوێنن. بە پێی ڕاپۆرتی **هیرۆدۆت**:

*شێوەی ئەم کارە بەم جۆرە بوو: کەشتییەکانیان وەکو بناغەیەکی پتەو لێك بەستەوە.* **٣٦٠** *کەشتیان لە لای دەریای ڕەش و* **٣١٤** *کەشتی تریشیان لە لایەکی تر دانا. لای پێشەوەی کەشتییەکان بەرەو ئاراستەی شەپۆلی دەریا بوو تاکو بە هۆی ئەو فشارەی دەهاتە سەر ئەو گوریسانەی کە کەشتییەکانیان پێبەستبۆوە، پردەکان لە هەردوو لا رابگیرێن، بۆ ئەم مەبەستە لەنگەرە قورسەکانیان لە هەردوو لای سەرەوە و خوارەوەی ئاراستەی شەپۆلی دەریا داکوتا. لەنگەرەکانی لای ڕۆژهەڵات بۆ ڕاگرتنی پرد لە بەرامبەر هێزی ئەو بایانەی، کە لە لای دەریای ڕەشەوە هەڵدەکراو ئەوانی تر لە لایەکی تر و لە ئاراستەی دەریای ئیژەوە بۆ مەبەستی ڕاگرتنی پرد لە بەرامبەر بایەکانی ڕۆژئاواو باشوور بوو... هەرکە کەشتییەکانیان سەقامگیرکرد بە دەستگیرەی داری گوریسەکانیان لە هەردوو*

*لای کەناری دەریا بەستەوە. جۆر و قەبارەی ئەم گوریسانە یەکسان بوو، بەڵام رستەی تاروپۆیان لە جۆری تەنافی پتەوی پاپیرۆسی بوو. ئینجا داریان بە رادەی درێژی و پانی پردە مەلەوانەکە بڕی و لە لایەکەو بۆ لایەکی تر توند بە گوریس بەستیانەوە و بەلای سەرەوەیان لکاندن. دوایی بۆ مەبەستی هەموارکردن، خاك و خۆڵیان رووکردە سەر ئاستی پردەکە و خۆڵەکەیان زۆر بە باشی کوتیەوە تاکو توندو پتەوبێت. سەرەنجام لە هەردوو لێواری پردەکە شوورەیەکیان دروست کرد تاکو چوار پێ و ئاژەڵەکانی تر لە کاتی تێپەڕین لەسەر پرد لە دیمەنی پڕ شەپۆلی دەریا نەتۆقێن*(٦٥).



**وێنەیەکی خەیاڵی پردی خەشایارشا لە داڕدانێل. کاتێك کە بە هۆی کەوتنەوەی تۆفان ئەم پردە داڕما، ئیمپراتۆر فرمانی دا بۆ سزادانی ئاو بە قامچی لە ئاوی دەریا بدەن.**

دوو ساڵ بەر لە دروستکردنی ئەم پردە پلان و نەخشەیەکی داهێنەرانەو شارازایانە داڕێژرابوو. خەشایارشا بۆ پیشاندانی بیرمەندی خۆی فرمانی دا ئاودڕگە (کاناڵ) ێك لە نیمچە دوورگەی **"ئاتۆس** Atos" کە دەکەوێتە باکووری دەریای **ئیژە** هەڵکەنن، تاکو ڕێگەیەکی تر بێت بۆ خێراتر تێپەڕینی هێزەکانی دەریایی لە باشووری کێوی ئاتۆسەوە. جگە لەمە مەبەستی فەرمانڕەوا لەم کارە ئەوەبوو، کە لە ڕێگەی ئەم ڕێگە ئاویەوە ئاسانکارییەك لە کاری بازرگانی لەگەڵ ساتراپی یۆنان بێتە ئاراوە. **هیرۆدۆت** دەنووسێ: "ئەم ئەنجامە دەست دەکەوێ، کە



خەشایارشا لەم کارەی دا مەبەستی ئەوەبوو خۆی پیشان بدات و ویستوویەتی سنووری دەسەڵاتی خۆی پیشان بدات... چونکە هیچ بەربەستێك لە ئارادا نەبوو، تاکو کەشتییەکان لە ڕێگەی وشکاییەوە بەرەو لایەکەی تر بگوازنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فرمانی هەڵکۆڵین و دروستکردنی ئاودڕگەی دەرکرد. چونکە لەم شوێنەدا ئاستی پانتایی دەریا ئەوەندە نەبوو تاکو دوو کەشتی لێیەوە تێپەڕێت.(٦٦)"

**ئاودڕگەی خەشایار شا**

**هیرۆدۆت** لە کتێبی **"مێژووەکان"** ی دا بەم جۆرە وەسفی دروستکردنی ئەو ئاودڕگەیە دەکات، کە خەشایارشا فرمانی دروستکردنی دابوو:

"زەوییەکانیان بۆ ئەو کەسانەی کە لە هۆزە جیاجیاکانی ئێرانییەوە هاتبوون بۆ چەند پارچەیەك دابەش کردبوو، تاکو کاری تێدا بکەن. کاتێك، کە قووڵکە دەگەیشتە قووڵاییەکی دیاریکراو ئەو کرێکارانەی کە لە خوارەوە کاریان دەکردو قووڵکەیان لێدەدا خۆڵەکەیان لەناو سەبەتەی گەورە دەکردو دەیانگەیاندە دەستی ئەو کرێکارانەی تر کە لە سەرەوەی ئەوان لەسەر پەیژە راوەستابوون. هەروا ئەم سەبەتە خۆڵانە دەست بە دەست بەرەو سەرەوە رەوانە دەکرا، تاکو دەگەیشتە دەستی ئەو کەسانەی، کە لەسەر زەوی بوون و دوایی خۆڵەکەیان دەڕێشتە ناو دەریا. گشت ئەو کەسانەی کە لەم کارەدا بەژداریان دەکرد بە چەشنێك ئەم قووڵکانەیان لێدەدا، کە سەروبنیان بە قەد یەك بەرین بوو، لەبەرئەوە بەردەوام خۆڵی قەراغەکان بەرەو خوارەوە هەڵدەوەری و کاری کرێکارانی قوورستر دەکرد. بەڵام فینیقییەکان لەو بەشەی کە پێیان سپێردرابوو، قووڵکەیەکی گەورەتر لەوەیان هەڵدەکەند، کە مەبەستیان بوو. هەرچەندی بەرەو خوارەوە دەڕۆیشتن وردە وردە لە پانی قووڵکەیان کەم دەکردەوە و لە کۆتاییدا قووڵکەیەکی تەواو بەدی دەهات.

## ئەو کوڕەی کە وەکو باوکی بە بەزەیی نەبوو

لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرمانڕەوای نوێ لە رووی سەربازییەوە ئیمپراتۆرێکی کارزان و لێهاتوو بوو، بەڵام لە خۆبایی بوو و بەڕادەی باوکی وردبین و لەسەرەخۆ نەبوو. یەکێك لە کارە ساویلکەکانی خەشایارشا ئەوەبوو رکە لە پاش ئەو تۆفانەی روویدا و بە هۆیەوە پردی داردانێل داڕما، ئەم هەڵوێستەی نواند و **هیرۆدۆت** بەم چەشنە ئاماژەی پێدەکات:

*کاتێك هەواڵی ئەم کارەساتە گەیشتە فەرمانڕەوا، خەشایارشا تووڕەبوو و فرمانی دا سێ سەد قامچی لە هێلسپۆنت بدەن... هەروەها فرمانی دا هێلسپۆنت سزابدرێت و بەم پێیە دوو قوفل و زنجیری تێ باوێن و بڵێن: "ئەی ئاوی پڕ شەپۆڵی تاڵ و سوێر، خاوەنەکەت ئەم سزایانەی بۆ داناوی، بۆ تۆ، کە کارەکانی ئەوت تێکدا. بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت خەشایارشا بەسەرتدا تێدەپەڕێت و لەمەودواوە هیچ کەسێك بۆ تۆ و لەبەر تۆ قوربانییەك ناکات و تۆش بەو ئاوە سوێرو قوڕاوییە ئیتر شایانی ڕێزلێنان نابیت... جگە لەم سزایانەی کە بۆی دانا، فرمانی دا تاکو بەرپرسانی دروستکردنی پرد بەتوندی سزابدرێن و ئەرکی دروستکردنی پردی نوێی خستە ئەستۆی کەسانێکی ترەوە[٦٧].*



**خەشایارشا لە دیوانی ئیمپراتۆرییەتی ئێراندا. پاش سەرنەکەوتنی لەشکری ئێران لە کاتی هێرشبردنی ڕاستەوخۆ و خێرا لەڕێی ئیژەوە بۆ ناو خاکی یۆنان، کە شکستی ماراتۆنی لێکەوتەوە، ئیمپراتۆر بڕیاری دا وردەوردە لەشکری پیادەی ئێران بەرەو تەراکییە و باکووری یۆنان ڕەوانە بکات.**



هەندێ لە زانایان پێیان وایە، سزادانی ئەم ڕێگە ئاوییە بۆ هۆکاری ئایینی دەگەڕێتەوە، چونکە بە پێی بیروباوەڕی ئایینی زەردەشتی ئاوە سوێرەکان بە دەستی ئاهریمەن سوێرکراون. یان هەندێکی تر ڕایان وایە، ئەم کارەی شای گەورە بۆ مەبەستی بەهێزکردنی هێزی دەروونی سەربازانی نائێرانی بووە تاکو پێیان پیشان بدات، ئیمپراتۆری ئێران تەنانەت دەسەڵاتی بەسەر هێزە سروشتییەکانیش دا دەشکێت. ئەگەرچی ئەم بۆچوونانە ناتوانێت شیکردنەوەیەك یان پشت ڕاستکردنەوەیەك بن بۆ ڕەفتاری بێ بەزەییانەی خەشایارشا، کە فرمانی دا سەری ئەو ئەندازیارانە ببڕنەوە کە لە کەوتنەوەی تۆفان بێ‌تاوان بوون.

هەورەها ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی کە لە پاش دروستکردنەوەی پرد ڕوویدا، شایستە نەبوو. کاتێك سەربازەکان بۆ مەبەستی ڕۆیشتن بۆ **داردنێل**، شاری **ساردیان** بەجێهێشت. یەکێك لە خزمەتکارە بەرەگەز لیدیاییەکانی فەرمانڕەوا کە ناوی **"پی تیووس Pythius"** بوو و پێنج کوڕی لە ڕیزی سەربازانی سوپای ئێران بوو، داوای لە ئیمپراتۆر کرد گەورەترین کوڕی ئەرکی خزمەتی سەربازی لەسەر شان لابدرێ، تاکو بتوانێ خێزان وماڵی خۆی و ئەوانی تر بەڕێوەببات. پاشا لە بەرامبەر ئەم داوا ڕەوایە هەڵسوکەوتێکی یەکجار توندی نواند. بە پێی نووسراوەکانی **هیرۆدۆت، خەشایارشا** " فرمانی دا جەلادەکان بە تەمەنترین کوڕی ئەم پیاوە بدۆزنەوەو لە ناوەڕاستەوە بیکەنە دوو پارچە و هەر پارچەیەکی لەلایەکی ئەو ڕێگەیە هەڵواسن، کە سوپاکەی پێدا دەڕۆیشت. ئەم فرمانە جێبەجێکراو سوپاکە بەڕێکەوت.(٦٨)" ئەم ڕەفتارە ستەمکارانەیە پیشاندەری ئەوەیە، کە خەشایار وەکو فەرمانڕەوایەکانی پێش خۆی، واتا داریووش و کورووش زۆر بەبەزەیی و بەخشندە نەبووە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەشایارشا لە بواری سیستەمی سەربازییەوە توانی وەپێش فەرمانڕەوایانی ناوداری پێش خۆی بکەوێتەوە. ئەو هێزە سەربازیانەی، کە لە بەهاری ساڵی ٤٨٠ ی پێش زایین گەیشتنە **داردانێل** سەرجەم هێزەکانی پێش خۆیان خستە ژێر کاریگەری. ژمارەیان دەگەیشتە دوو سەد هەزار سەربازی پیادەو سوارچاك و هەشت سەد تاکو هەزرا کەشتی جەنگی و بەلایەنی کەم ١٥٠هەزار مەلەوان و خزمەتکار و ژمارەیەکی زۆریش هێزی پشتیووانی، هەروەها ژمارەی سەربازانی پێگە کاتییەکان تاکو نزیکەی سێ سەد هەزار کەس مەزەندە کراوە[٦٩]. گەورەیی مەترسی ئەم هێزە لە بەرامبەر ژمارەی کەمی سوپا سەربازییەکانی یۆنانی زۆر بە ئاشکرایی بەدیار دەکەوێت. تەنانەت گەورەترین دەوڵەت- شارەکان (کە ئاتین لە ڕیزی پێشەوەیان بوو) دەیانتوانی تەنیا نزیکەی هەزار سەربازی جەنگاوەر کۆبکەنەوە و زۆربەیان زیاتر لە چەند سەد سەربازێکیان

نەبوو. جا بۆیە سەیر نییە، ئەگەر شەپۆلی ترس و تۆقان لەگەڵ بینینی ئەم سوپا سەربازییە گەورەیەی ئێران، کە هاتبووە ناو سنووری خاکی ئەوروپا، سەرتاسەری یۆنان نەگرێتەوە. **هیرۆدۆت** بەم چەشنە وەسفی ئەم لەشکرە گەورەیە دەکات:

*پۆلی سەربازانی پیادە و سوارچاکان لە پردی سەرەوە، کە لە لای راستی دەریای رەش درووستکرابوو تێپەڕین و چوارپێکان و خزمەتکاران لە پردەکەی تر کە دەکەوتە لای چەپی دەریای ئیژە. سەرەتا دە هەزار سەرباز [سەربازانی لیوای نەمر] کە هەموویان تاجی گوڵینەیان لەسەر بوو تێپەڕین و ئینجا بەدوای ئەمانەوە پۆلی سوپا سەربازییەکان، کە سەربازانی نەتەوە جیاجیاکانی دەگرتەوە، تێپەڕین. سەرتاسەری رۆژی یەکەم بۆ تێپەڕینی ئەم سوپا گەورەیە تەرخانکرا. رۆژەکەی تر سەرەتا پۆلی سوارچاکانی هەزارکەسی و ئینجا رمهاوێژان بە کورتە رمی ناو دەستیانەوە بەرەو لای خوارەوە رۆیشتن. ئەمانەش گشتیان تاجی گوڵینەیان لەسەر بوو. ئینجا ئەسپە پیرۆزەکان و دوای ئەم ئەسپانەش کەژاوەی پیرۆزیان پەڕاندەوە. پاشان خەشایارشا لەگەڵ رمهاوێژان و سوارچاکانی تایبەتی خۆی کە لەگەڵ ئەودا دەرۆیشتن و پاشماوەکەی تری سوپا، کە دوابەدوای ئەو بەرێکەوتبوون، لەوێ تێپەڕین. هاوکات پێداویستییەکانی هێزی دەریاییش لە کەناری رۆژهەڵاتەوە بەرەو ئاراستەی بەرامبەر گوازرانەوە... تێپەڕینی سەرجەم پۆل و دەستە سەربازییەکان حەوت شەو و رۆژی خایاند[٧٠].*



**تێپەڕینی کەشتییەکانی خەشایارشا لە داردانێل، وێنەیەکی خەیاڵی، کە لە کانگای بەهرەی هونەرمەندێکی ئەڵمانی لە ساڵی (١٦٣٣) وە هەڵقوڵاوە.**



## بەرێکەوتنی ئێرانییەکان بەرەو ئاتین

هاوکات لەگەڵ تێپەڕینی سوپای گەورەی خەشایارشا لە ناوچەکانی باکووری یۆنان، زۆربەی دەوڵەت- شارەکانی ئەم هەرێمە لە ترسی لەناوچوون، بێ جەنگ و خۆڕاگری خۆیان بە دەستەوە دا. ئەویش چاوەڕوانی ئەم شتانەی دەکرد، چونکە راوێژکارە یۆنانییەکانی پێیان گووتبوو: لەوانەیە تەنیا بەهێزترین دەوڵەتەکانی باشووری یۆنان واتا ئاتین و ئیسپارت دژی ئەم سوپا گەورەیە بوەستن. هەروەها پێیانگووت: تێپەڕین لە "**تێرمۆپیل** Thermopylae" کە نزیکەی سەدو پەنجا کیلۆمەترێك لە باکووری ئاتێن دوورە، باشترین رێگەیەکی کوێستانی ناوەندی یۆنانە. چونکە وەکو دڕگەیەك کەوتۆتە نێوان وشکایی و دەریا و لەوێوە بە ئاسانی سوپاکانیان دەستیان دەگاتە کەشتییەکانیان. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئێرانییەکان لە ژووییەی ساڵی ٤٨٠ی پێش زایین گەیشتنە، ئەم دڕگە کوێستانییە، زانیان هێزێکی بچووکی هووپۆلیتەکانی یۆنانی رێگەی ئەوانیان داخستووە.

دروستکردنی شوورە و دیواری بەرگری لە تێرمۆپیل چەند مانگ پێشتر دەست پێکرابوو، یۆنانییەکان لە بەرامبەر ئەم هێرشە بەرفراوانە نوێنەرانی **٣١ دەوڵەت- شاری** خۆیان رەوانەی "**کۆرینت** Corinth" ی ناوچەیەکی باکووری **پۆلۆپۆنز** کرد و لەوێدا کۆبوونەوەیەکی گەورەیان سازدا. ئامانجی کۆبوونەوەی ئەم دەوڵەتانە، کە بەردەوام لەگەڵ یەکتریدا دەجەنگان و ناکۆکییان هەبوو، ئەوەبوو تاکو رێگەچارەیەك بدۆزنەوە بۆ یەکگرتن و دانانی ستراتیژییەکی هاوبەشی بەرگری بۆ پاراستنی دەوڵەتەکانیان. سەرکردە یۆنانییەکان بە تایبەتی گەورەترین سیاسەتوانە چالاکەکانی ئاتینی وەکو "**تێمیستۆکلیس** Themmistocles" دەیانزانی بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای گەورەی خەشایارشا پێویستیان بە هێزێکی پیادەی گەورەی زەمینی هەیە. ئەو هێزەی، کە کۆکردنەوەو ئامادەکردنی ئەگەر لە رێگەی **دەوڵەت- شارە** جیاجیاو بچووکەکانیشەوە بووایە، کاتێکی زۆری دەویست. کەواتە باشترین رێگا ئەوەبوو، تاکو هەوڵ بدەن هێزی دەریایی ئێران لەناوببەن. ئەوان بە تەواوی بۆیان دەرکەوت، کە سوپای ئێران بێ یارمەتی و پاڵپشتی هێزی دەریایی تارادەیەکی زۆر پەکی دەکەوێ و لەناودەچێت. بەم چەشنە پلانی سەرەتایی ئەوەبوو کۆمەڵێکیان سوپا سەربازییەکانی خەشایارشا لە باکوور رابگرن و تاکو تێمێستۆکلێس و دەریا سالارانی تر هێزێکی دەریایی یەکگرتوو پێك بێنن.

بریاریان دا تێرمۆپیل بەهێزتر بکرێ و لەوێدا شوورەو دیواری بەرگری دابمەزرێنن، چونکە ئەم دڕگەیە تەسك بوو و بەرینییەکەی تەنیا پەنجا پێ بوو. هیرۆدۆت دەڵێت: "دروستبوونی ئەم

بیرۆکەیە لای ئەوان [ یۆنانییەکان] لەوەی، کە ئێرانییەکان لەم دڕگەدا ناتوانن کەڵك لە سوارچاکان یان هێزی سەربازانی خۆیان وەربگرن، وای لەوان کرد کە لەم شوێنەدا پێش هێرشبەران بگرن.[٧١]" **لیۆنیداس** Leonidos ی فرمانڕەوای **ئیسپارت** بەرپرسیارەتی ئەم کردە سەربازییەی بە ئەستۆ گرت و سێ سەد جەنگاوەری هەڵبژاردراوی دەستنیشان کرد و بەرەو باکوور بەڕێکەوت. لەسەر ڕێگاش هووپۆلیتەکانی شارەکانی تریش هاتنە ریزی ئەم جەنگاوەرانە، بە چەشنێك کە کۆی ئەم هێزانەی کە لەگەڵ لیۆنیداس گەیشتنە دڕگەکە، نزیکەی حەوت هەزار کەس مەزەندە دەکرا.

خەشایارشا لە سەرەتادا دڵنیابوو هێزەکانی بە ئاسانی پۆلی سەربازانی یۆنانی لە دڕگەکەوە رادەماڵێت و ڕێگەی راستەوخۆ بۆ ئاتین دەکرێتەوە. بەڵام چەکی قورس و کارامەیی و بوێری لە جەنگ و بڕیاری نەگۆڕی هووپۆلیتەکان وەکو جەنگی ماراتۆن، هێزێکی زۆری بە سەربازانی یۆنانی بەخشی بوو. ئەگەرچی لە رووی ژمارەوەش کەمبوون. "**دیۆدۆرووس** Diodorus" بەم چەشنە وەسفی یەکەمین رۆژی جەنگ دەکات، کە تێیدا یۆنانییەکان لەسەرەتادا بەسەرسامییەوە، بەسەر هێزی بەتوانای دوژمن سەردەکەون:

*ئەو جەنگەی کە دەستپێکرا یەکێك لە توندترین و دژوارترین جەنگەکان بوو، چونکە فرمانڕەوای بەربەرەکان [ئێرانییەکان] بینەری دلاوەری سەربازەکانی بوو، و یۆنانییەکانیش بۆ پاراستنی سەربەستی خۆیان دەجەنگان... جەنگ و پێکدادان گەیشتە قۆناغێکی سەرسووڕهێنەر. سەربازەکان شان بەشانی یەکتری دەجەنگان... لێدانی شمشێری سەربازان لە کاتی جەنگی رووبەڕووی یەکتر. ریزی سەربازەکان لەناو قەڵەباڵغی بەرەی جەنگ وێك دەهاتەوە، تاکو ماوەیەکی زۆر هێزی هەردوو بەرەی جەنگ بە یەك ڕادەبوو. بەڵام... وردە وردە ئێرانییەکان ماندووبوون. چونکە زۆربەیان کوژران و زۆریشیان بریندار ببوون... سەرەنجام خەشایار بینی کە سەرتاسەری دڕگەکە پڕبووە لە لاشەی سەربازانی مردوو. و ئێرانییەکان توانای خۆڕاگری لەبەرامبەر... یۆنانییەکانیان نەماوە، سەربازانی ((لیوای نەمر)) ی نارده ناو مەیدانی جەنگ کە نەترس بوون و لە جەنگاوەریدا کارامە بوون. بەڵام ئەوانیش پاش کەمێك خۆڕاگری و جەنگ بەرگەیان نەگرت و هەڵاتن، ئینجا شەو داهات و جەنگ راوەستا لە کاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆر لە ئێرانییەکان و ژمارەیەکی کەمی یۆنانییەکان کوژرا بوون.[٧٢]*



کاتێك خەشایارشا زانی لەوانەیە یۆنانییەکان بتوانن بۆ ماوەیەکی نادیار دڕگەکەیان لەدەست دابێ و خۆیان رابگرن، بەدوای دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی تر کەوت. زێڕو ئاڵتوونێکی زۆری دایە یەکێك لە سەربازە خاینەکانی یۆنانی تاکو کوێرە ڕێیە شاخاوییەکانی پیشان بدات و ئێرانییەکان بتوانن لەوێوە بەرەو پشتەوەی شوێنی یۆنانییەکان بسووڕێنەوە. کاتێك کە لیۆنیداس زانی دەستەیەکی گەورەی سوپای ئێران لە پشتەوە ڕێگەیان لێ گرتووە، زۆربەی سەربازانی یەکێتی یۆنانی رەوانەی ماڵەوە کردەوە و خۆی و سێ سەد سەربازی ئیسپارتی و نزیکەی هەزار سەربازی تری یۆنانی بڕیاریان دا تاکو دوایین دڵۆپی خوێنیان بجەنگن. ئەم یۆنانییانە کە لەلایەن ئێرانییەکانەوە گەمارۆدرابوون گشتیان کوژران.

ئێستا خەشایارشا بەبێ هیچ بەربەستێك هێزەکانی خۆی بەرەو باشوور دەبرد. لە رۆژی هەڤدەی سێپتامبەر (کۆتاییەکانی مانگی خەرمانان) یان چەند ڕۆژێك زووتر یان درەنگتر، لە ساڵی ٤٨٠ی پێش زایین چوونە ناو ئاتین و بە سەرسامییەوە بینیان ئاتینییەکان شاری خۆیان چۆڵ کردبوو و بەرەو دوورگەی "**سالامیس** Salamis" و شوێنە نزیکەکانی تر هەڵاتوونە.

تەنیا چەند کەس لە پیرە بەساڵاچووەکان و هەندێ لە خورافەپەرستەکان پەنایان بردبووە "ئاکرۆپۆلیس Acropolis" کە دەکەوتە سەر گردێکی ناوەندی شار. خەشایارشا فرمانی دا تاکو لەوێ دەریان بکەن. کاتێك کە ئەمانە بینیان ئێرانییەکان وا نزیك دەکەونەوە، بە پێی نووسینی **هیرۆدۆت**:

*زۆر ترسان، هەندێکیان خۆیان هەڵدا خوارێ و کوژران و هەندێکیان خشینە ناو پەرستنگەکە. پێشەنگانی سوپای ئێران یەکسەر بەرەو دەروازەکان رۆیشتن و کردنیانەوەو ئەو کەسانەی کە هانایان بۆ ئەوێ برد، کوشتران و بەزەییان بە کەس دا نەدەهاتەوە، چونکە کەس زیندوو نەمابۆوە دەستیان بەسەر خەزێنەکانی پەرستگە داگرت و قەڵای ئاکرۆپۆلیسیان ئاگر تێبەردا. خەشایارشا کە ببووە خاوەنی ئاتین، نێردراوێکی خۆی بەرەو شاری شووش رەوانەکرد و سەرکەوتنی خۆی... راگەیاند[٧٣].*



**لەشکری ئێران ( لە پێشەوەی وێنە) سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان لە بەرامبەر ئیسپارتی و یۆنانییەکانی تردا لە دەرگەی تێرمۆپیل نەبوو، بەڵام لە ئەنجامدا ئەم دەروازەیە بە هۆی خیانەتی یۆنانییەك کراوە.**

## شینگێڕان لە شووش

سەرکەوتنی شای گەورە تەمەنێکی زۆری نەبوو، چونکە گرتن و داگیرکردنی کەم تەمەنی شاری بێ دانیشتوانی یۆنان لە راستیدا ئەوپەڕی سەرکەوتنی ئەو بوو و بێ هیوایانەو بە نادڵی لەم باردۆخەی دەڕوانی. لەگەڵ ئەوەشدا، کە کۆمەڵە پلانێکی سەربازی و دەریایی داڕشترابوو، چەند هۆکارێکی فکری و دەروونی بوونە کۆسپ لەبەردەم سەرکەوتنی دا. سەرەتا هووپۆلیتەکانی یۆنانی چەندین جار سەرکەوتنی خۆیانیان بەسەر هێزی پیادەی ئێرانییەکان بەدیارخست. ئەمەش تاڕادەیەك بۆ ئەوە دەگەڕاوە، کە ئەوان زرێ و قەڵغانی کاراتریان هەبوو و بۆ شەڕکردن لە کەش وهەواو و شوێنیکی بچووك و داخراو باشتر پەروەردەکرابوون. جگە لەمە، یۆنانینەکان تایبەتمەندییەکی دەروونیشیان هەبوو، ئەویش ئەوەبوو بۆ سەربەستی دەجەنگان و بە



پێچەوانەی سەربازانی ئێرانی کە لەبەر ئارەزوو خواستی فەرمانڕەوایەکی دیکتاتۆر دەجەنگان. زۆربەی یۆنانییەکان لە واتای سەربەستی و مافی چارەی خۆنووسین تێدەگەیشتن. هووپۆلیتەکان کە بەرگریان لە ئاو و خاك و شێوەی ژیانی خۆیانیان دەکرد بەوپەڕی هێزو تواناوە و بە ناچاری و هەندێ جاریش نەترسانە دەجەنگان. بە پێچەوانەوە یەکە سەربازییە مەزنەکانی ئێران پڕبوون لە سەربازی ئیجباری و بەکرێگیراو، کە سەر بە هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری بوون و بەرامبەر بە خەشایارشا هەستێکی وەفاداربوونیان نەبوو و بەدڵ و بە گیان بۆی نەدەجەنگان.

سالێك پاش چوونی بۆ ئاتین ئەم هۆکارانە سێ شکستی گەورەیان بۆ خەشایارشا بەدی هێنا. ناخۆشترین شکستی فەرمانڕەوای ئێران لە کەنداوی سالامیس روویدا، کە چەند مایلێك لە باشووری ئاتین دووره: هێزی دەریایی خەشایارشا لەلایەن هێزی دەریایی یەکگرتووی یۆنانی بە سەرکردایەتی تێمێستۆکلێس تێك شکێنرا. شای گەورە لەسەر ئەو تەختەی کە لەسەر بەرزایی تەپۆلکەیەك بەرامبەر بە کەنداو دانرابوو، سەیری بەرەی جەنگی دەکرد. شانۆنووسی یۆنانی "**ئاسخیلووس** Aschylus" دواتر لەشانۆنامەی "**پارسییەکان**"دا دیمەنەکانی ئەم جەنگەی وێنەکێشاوە. لەم شانۆنامەیەدا هەواڵگەیێنێکی ئێرانی کە بەرەو شووش گەڕاوەتەوە، بەم جۆرە وەسفی بەرەکانی جەنگ دەکات بۆ **ئاتۆسای** شاژنی دایك:



**ژمارەی زۆری رم و قەڵغانەکانی فالانکێسێکی یۆنانی، کە یەکەیەکی سەربازی ئێرانییان بەتەواوی لەناوبردووە**

*لە پڕا کەشتییەکان تێکهەڵچێژران و پێشەوەی پتەو و کانزاییان پێك کەوت و وردبوو. سەرەتا کەشتییەکی یۆنانی هێرشی کرد و کەشتییەکی ئێرانی تێك شکاند. ئینجا هێرشی کەشتییەکان لە هەموو لایەکەوە دەستی پێکرد. سەرەتا هێزی دەریایی ئێمە بە هۆی توانا گەورەکانی رووبەڕوویان بۆوە. بەڵام بە هۆی تەسکی شوێنەکە سەدان کەشتی ئێمە لێك گیربوون بە جۆرێك کە هیچ کامیان نەیاندەتوانی یارمەتی ئەوی تر بدەن. پێشەوەیان پێك دەکەوت و خزمەتکارانی هەندێ لە کەشتییەکان کەوتنە ناو ئاو. لەم کاتەدا کەشتییەکانی دوژمن بەدیارکەوتن دەوری ئێمەیان گرت و هێرشیان هێنا. چەك و ئامێرەکانی جەنگیمان خوار ببوون و دەریا پڕببوو لە لاشەی مردوو و پارچەی کەشتی تێکشکاو. کەنارەکان و لێواری دەریاو بەندەر پڕ ببوو لە لاشەی مردوو. ئینجا هەرکام لە کەشتییەکانی ئێمە، هەوڵی دا ڕێزەکە لێك بکاتەوەو و لەم گێژاوە دەربچێت و هەڵبێت. یۆنانییەکان پارچەی شکاوی کەشتییەکانی ئێمەیان کۆکردەوە و سەربازانی بریندار و زامدارمان، کە کەوتبوونە ناو دەریاو مەلەوانیان دەکرد، دەستگیرکران... سەرتاسەری دەریا ببووە یەکپارچە هاوار و ناڵەناڵی سەربازانی بریندار کە لەسەرە مەرگ دابوون تاکو شەو داهات و تاریکی هەموو لایەکی داپۆشاند[٧٤].*

کاتێك هەواڵی ئەم کارەساتە گەیشتە شووش، یەکەمین کاردانەوەی شێوان و باوەڕنەکردنی ئەم ڕاستییە بوو، ئینجا هەزاران کەس لە خەڵکی ئێران نەریتێکی باوی ئێرانی بوو بۆ پیشاندانی خەم و ماتەم بە ئاشکرا دەستیان بە شین و گریان کردو جل و بەرگی خۆیان هەڵدڕی.

شووش و شارەکانی تر تاکو رۆژی گەڕانەوەی خەشایارشا کە نزیکەی یەك ساڵی پێچوو، هەروا شینیان دەگێڕا. زۆربەی سەرچاوە رۆژئاواییەکان رۆیشتنی فەرمانڕەوا بۆ سارد بەر لە رووداوی سالامیسیان بە پاشەکشەیەکی ترسنۆکانە لە قەڵەم دا. بەڵام زۆرتر واپێدەچێت خودی فەرمانڕەوا ئەم شکستەی بۆ بێ بەختی و بەد ئیقبالی بگەڕێنێتەوە. خەشایارشا هێزی پیادەی خۆی بەجێ هێشت و **مەردوونییەی** سەرۆکی ئەم یەکەیەی بەوە راسپارد تاکو لەسەر ئەرکی خۆی واتا راگرتنی باشووری یۆنان بەردەوام بێت. لە راستیدا مەردوونییە فەرمانڕەوای هان دا تاکو بەرەو وڵات بگەڕێتەوەو بەڵێنی دا: "من بە ئەرکی خۆمی دەزانم... کە سەرتاسەری یۆنان بۆ ئیمپراتۆر بگرم.[٧٥]"



بێگومان کاتێك لە هاوینی ساڵی داهاتوو (ساڵی ٤٧٩ی پێش زایین) بە خەشایارشایان راگەیاند، کە یۆنانییەکان لە جەنگێکی بێ وێنە لە پلاتێ سوپای مەردوونییەیان بە تەواوی تێك شکاندووە، زۆر سەرسام بوو. سەرکەوتنەکەی تری یۆنانییەکان کە چەند رۆژ دواتر لە **"میکال** Mycale" ی نزیك **لادێ** لە کەناری **ئیونییە** دەستەبەرکرا، بۆ خەشایارشا ئیهانەکردنێکی خراپتر لە شکست خواردن بوو. بەڵام دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەین، کە ئیمپراتۆرییەتی ئێران تووشی شکست نەببوو و تەنانەت مەترسی هێرشکردن بۆ سنووری ئیمپراتۆرییەکەشی لەئارادانەبوو. شکستی خەشایارشا لە یۆنان وەکو شکستی باوکی، لە ئێراندا بە کۆسپێکی بچووك و نەهاتێکی کاتی لە بەردەم بەرفراوانکردنی سنووری ئیمپراتۆری دادەنرا، کە ((مافی)) خۆی بوو.

## دڕکێك لە ناو جەستەدا

شکستی خەشایارشا لە یۆنان، بە هۆی هەڵەیەکی تاکتیکی بوو. هەم خەشایار و هەم ئیمپراتۆرانی دوای ئەویش بەخوێنی ئێرانییەکان بەهای ئەم شکستەیان داوە. سەرکەوتن بەسەر داریووش و خەشایارشا، یۆنانییەکانی وروژاند و ئەم باوەڕەی لەناو دڵیان بەدی هێنا، کە کلتوورو فەرهەنگێکی بەرزتر و دەوڵەمەندتریان هەیە و چارەنووسیان بۆ پێشهاتی گەورەتر دیاریکراوە. دوابەدوای پاشەکشەی هێزەکانی ئێران ئاتێن توانی ١٥٠ دەوڵەت- شاری یۆنانی دوورگەکانی دەریای ئیژە و ئیوونییە لەناو یەکێتی دێلیان Delian League دا کۆبکاتەوە. یەکێتی دێلیان یەکێتییەکی **سیاسی- سەربازی** بوو، کە ئامانجەکەی لەلایەك بەرگریکردن لە یۆنان و لەلایەکیتر بەردەوامبوون لەسەر هێرشبردنە سەر ئێران بوو[٧٦]. ئەم یەکێتییە بەخێرایی بووە دڕکێك لەناو جەستەی خەشایار شا. ئەگەرچی فشار و زەختی ئەمە تەنیا لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك بوو و هەڕەشەیەك نەبوو بۆ لەناوبردنی یەکپارچەیی خاکی ئێران، بەڵام خەشایارشا ناچاربوو بەردەوام لەشکر بەدوای لەشکر سەرباز بەرەو ئەم ناوچەیە ڕەوانە بکات، بەم جۆرە سەرچاوەیەکی زۆری مرۆیی و مادی، کە دەبوایە لە شوێنێکی تر بەکاربهێنرێ، لەوێ بەفیڕۆ دەچوو. جگە لەمە یۆنانییەکان بەردەوام سەردەکەوتن و گەورەترین سەرکەوتنیان لەناوبردنی هێزی بەتوانای ئێران لە دەروازەی رووباری **"ئێوری مێدۆن** Eurymedon" لە ساڵی ٤٦٩ی پێش زایین لە باشووری ئاسیای بچووك بوو.

**کوشت و کوشتار لەناو سەنگەری لە دار دروستکراو**

**دیۆدۆرووس** Diodorus لە **"کتێبخانەی مێژوو"**ی خۆیدا باسی ئەوە دەکات، کە ئێرانییەکان دوای شکستخواردن چۆن پەنایان بۆ سەنگەری دار برد و لەوێدا لە لایەن هووپۆلیتەکانی یۆنانی گەمارۆدران و کوژران.

هەردوو بەرەی جەنگ بە توندی دەجەنگان. بەربەرەکان [ئێرانییەکان] بە دلاوەری بەرگریان لە سەنگەرەکانی خۆیان دەکردو یۆنانییەکان هەڵیان دەکوتایە سەر دیوارە دارەکان، زۆربەیان بریندارببوون و بێ هیوایانە دەجەنگان و کۆمەڵێکی زۆریشیان بە بارانی [تیر و رم و بەرد] کوژران... نە دیواری لە دار دروستکراو و نە ژمارەی زۆری سەربازانی ئێرانی توانای بەرگریکردن لە بەرامبەر هێرشی یۆنانییەکانیان هەبوو... سەرەنجام ئێرانییەکان شکستیان خوارد و هیچ بەزەیی پێهاتنەوەیەك وەکو بەدیلگیرانیش ئەوانی نەگرتەوە. چونکە **"پائوزانیاس** Pauzanias" ی [ئیسپارتی] کە سەرداری یۆنان بوو، بینی ژمارەی سەربازانی ئێرانی یەکجار زۆرە... فەرمانی دا هیچ کەس بەدیل نەگیرێ بەم چەشنە سەرتاسەری گۆڕەپانی جەنگ پڕبوو لە لاشەی مردوو، و... کاتێك کە یۆنانییەکان سەد هەزار سەربازی ئێرانیان کوشت. ئینجا دەستیان لە کوشتن هەڵگرت.

خەشایارشا بە تێپەڕاندنی ئەو ساڵانە لە رووی رەوشی ناوخۆوە بارودۆخێکی باشتری نەبوو. جگە لەو چەند کۆشکە شکۆدارەی، کە لە تەختی جەمشید خرایە ریزی کۆشکەکانی ئیمپراتۆری، سەردەمی دەسەڵاتی ئەو بە شێوەیەکی ئاسایی و بەبێ هیچ تایبەتمەندییەك بەسەر چوو. زۆربەی وزەو توانای خۆی لە رێی سەرکوتکردن و چارەسەرکردنی پیلانی ناحەزانی ناو دیوانی فەرمانڕەوایەتی بەکاربرد و نەیتوانی کەڵك لە کەرەسە بەهێزە سیاسی و سەربازییەکانی وڵات، کە لە داریووشی باوکییەوە بۆی مابۆوە وەربگرێ. سەردار مێگابیز کە بەم دواییانە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە متمانەیەکی زۆری پێکرابوو، لە ساڵی ٤٦٥ی پێش زایین **"ئارتابان** Artabanus" فەرماندەی بەتوانای لیوای ئیمپراتۆری پەراوێز کرد.ئارتابان دوای ئەم رووداوە پیلانێکی سەرکەوتووانەی بۆ کوشتنی فەرمانڕەوا رێکخست. دوای مەرگی خەشایارشا پیلانگێڕان بەخێرایی ئەردەشێری هەژدە ساڵانەیان لە شوێن باوکی دانا. ئینجا جەستەی بێ



گیانی پاشای کوژراویان لەناو گڵکۆی بەردین لە تەك گۆڕی باوکی بە خاك سپارد، بەڵام خەشایارشا وەکو باوکی دەرفەتی ئەوەی نەبوو، تاکو نووسراوە بەردێنێك لەسەر گۆڕەکەی هەڵواسێ و باسی قارەمانییەتی و کارەکانی خۆی تێدا بنووسێ. خەشایار تەنیا ئیمپراتۆری ناکامی هەخامەنیشی لە بەرفراوانکردنی سنووری ئیمپراتۆری گەورەی ئێران بوو.



(٧)

## سێبەری کەمرەنگی ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە:
## لاوازبوون و لەناوچوونی ئێران

شێوەی ناشیرینی مەرگی خەشایار و ڕووداوە ناڕێکەکانی مانگ و ساڵانی دواتر، پیشاندەری لاوازبوونی ئیمپراتۆری بوو. هەروەها بێژەری لەناوچوونی بە یەکجاری ئەم دەسەڵاتە بوو. پیلانگێڕانی کوشتنی فەرمانڕەوا، تاوانی مەرگی ئەویان خستە گەردنی داریووش، کە گەورەترین کوڕی خەشایارشا بوو، کەچی ئەم شازادە گەنجە دەستی لەم کارەدا نەبوو. هەر بەخێرایی داریووش لە سێدارە درا. تاکو برا بچووکەکەی بەناوی ئەردەشێر تانجی فەرمانڕەوایی بخاتە سەری. بەمەش کوشتن و خوێنڕشتن کۆتایی پێ نەهات. بۆ ماوەی چەند مانگێك ئاڕتابان بە دەستێوەردان لەناو کارەکانی ئەردەشێر بە ئاشکرا جڵەوی فەرمانڕەوایەتییان بە دەستەوە بوو، تاکو خۆی ئەوەندە بەهێز بینی، کە فەرمانڕەوای گەنج بکوژێت و خۆی ببێتە پاشاو تاج و تەختی فەرمانڕەوایەتی بە دەست بێنێ. بەڵام لەو ناوەدا "**مێگابیز** Megabyzus" هاتە پێشەوەو دەستی لە کارەکان وەرداو هەوڵی تیرۆرکردنی ئیمپراتۆری گەنجی پوچەڵ کردەوە. پیلانەکە سەرکەوتوو نەبوو و ئاڕتابانی فریووکار لەکار لادرا. ئەردەشێر فەرمانڕەوایەتیەکی دوورو درێژ، بەڵام پڕ ئازاری دەست پێکرد. ئەردەشێر ئیمپراتۆرێکی بێ تواناو نەشیاو بوو، کە ڕێگەی بە دایکە جانباز و دەروونپیس و بێبەزەیی خۆی واتا "**ئامێستریس** Amestris" دەدا تاکو دەست لە کاروباری وڵات وەربدات، ئەم ژنە توانی جڵەوی ئیمپراتۆر بەدەستەوە بگرێ. بێ ویژدانانە کەیفی بە هەر کەسێك نەهاتبا، لەناوی دەبرد.

فەرمانڕەوایەتی پڕ لە تاوان و فریووکاری ئەردەشێر لە زۆر ڕوویەکەوە بووە نموونەیەك بۆ زۆربەی جێنشینەکانی، کە فەرمانڕەوایانێکی لەخۆبایی و کەمتەرخەم بوون. ئەمانە نەیاندەتوانی یان نەیاندەویست بە شێوەیەکی کاریگەر کێشەکانی ئیمپراتۆری چارەسەر بکەن، گرنگترینی ئەم بابەتانە ئەو ئاژاوەو نائارامییانە بوون، کە بە هۆی ململانێی بەردەوام، بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات لەناو دیوانی فەرمانڕەوایی ئێران لە سەرانسەری ئیمپراتۆری هاتبووە



ئاراوە. ئەمەش ببووە هۆکارێك بۆ دەربڕینی نارەزایی لەلایەن گەلانی ژێردەستی ئیمپراتۆری بەتایبەتی ئەو گەلانەی کە لە نیشتمانی سەرەکی ئێران دوور بوون. ئەو شاندو ڕاسپێردراوانەی کە لەلایەن فەرمانڕەوا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەم ناوچەیە ڕەوانە دەکران، بەزۆری دەسەڵاتی خۆیان بۆ پڕکردنی گیرفانەکانیان بەکاردەبرد. بەکاربردنی سەربازانی بەکرێگیراوی یۆنانی، کە لە بارەی ئێرانەوە هیچ جۆرە وەفادارییەکیان نەبوو، ڕۆژ بە ڕۆژ لەناو کاروباری سەربازی زیاتر دەبوو. هەروەها بێ مەیلی و پشتگوێخستنی گشت لایەنی لە سەرتاسەری ئیمپراتۆری بەدی کرا. کەواتە جێگەی سەرسووڕمان نەبوو، کە لە ڕۆژگاری دەسەڵاتداری ئەم فەرمانڕەوا کەمتەرخەم و بێ توانایانە گەورەیی سیاسەتی ئیمپراتۆرییەتی ئێران و ناوداربوونی بە دەسەڵاتی یەکەم و یەکبوونی پێکهاتەکەی، وردە وردە بەرەو لەناو چوون ڕۆیشت.

ئینجا لە کۆتاییدا ئەوەی کە مابۆوە ئیمپراتۆریەکی لاواز و کز و بێ تواناو لە ڕاستیدا سێبەرێکی کەمرەنگ بوو لەو شتەی، کە کورووش و داریووش فەرمانڕەوایەتیان بەسەردا دەکرد. ئەم ئیمپراتۆرییەتە بەم بارودۆخە ناچاربوو ڕووبەڕووی گەورەترین قەیرانەکانی مێژووی ئێران ببێتەوە. ئەو دەسەڵاتەی کە لە دەیەی ٣٣٠ی پێش زایین ئێرانی بانگەشەی جەنگ کرد، لە سکی دوژمنێکی کۆنی ئێران واتا یۆنان لە دایکبوو. هێزەکانی یۆنانی یەکگرتوو بە سەرۆکایەتی **ئەسکەندەری مەقدوونی** سوپاکانی ئیمپراتۆری ئێرانیان تێك شکاندو سەرتاسەری وڵات تاکو دەروازەکانی شووش و تەختی جەمشید کەوتە ژێر پێی ئەسپەکانیان. لەم کاتەدا بوو کە ئێرانییەکان بە درەنگەوە زانیان سەرنەکەوتنی یەکەمیان واتا نەگرتنی یۆنان، هەڵەیەکی گەورە و چارەنووس سازبووە.

### زێدەویستی، بێ بەزەیی و لەناوچوون

ئەنجامەکانی لەناوچوون و لاوازبوون لە سەرەتادا لەسەرەخۆ و بە ئەسپایی بوو. ئەمە لەوەوە دەستەبەر دەکرێ کە لە سەرەتاکانی ساڵانی فەرمانڕەوایەتی ئەردەشێر ئیمپراتۆرییەتی ئێران هێشتاش بە دەسەڵاتێکی جیهانی دادەنرا. لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرکردایەتی لاواز و بارودۆخی ناو دیوانی ئیمپراتۆریش نالەبار بوو، زۆربەی ساتراپەکان و سەردارانی ئێران کەسانێکی شایستەو لێهاتووبوون، کە سنووری ئیمپراتۆریان دەپاراست.

نموویەکی دیاری توانایی سەربازی ئێران، سەرکوتکردنی شۆڕشێکی گەورە لە ساڵی ٤٦٠ی پێش زایین بوو کە لە میسر ڕوویدا. **دیۆدۆرووس** لەم بارەوە دەڵێت:



**ئەردەشێری یەکەم، ئیمپراتۆری ئێران و جێنشینی خەشایار بڕیاری دا یۆنانییەکان لە میسر دەربکات و جارێکی تر ئەم وڵاتە بخاتە ژێر باڵی ئیمپراتۆرییەتی ئێرانی. ئەم فەرمانڕەوایە بە هۆی کارزانی و لێهاتوویی "مێگابیز" ی سەرداری ئێرانی لەم کارەی دا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.**

*خەڵکی میسر... بڕیاریان دا بۆ ئازادی خۆیان راپەڕینێك سازبکەن... لەم رووەوە لەشکرێکی سەربازییان پێکهێناو دژ بە ئێران رابوون. دوای دەرکردنی ئەو ئێرانیانەیان کرد، کە لەوێدا ئەرکی کۆکردنەوەی باجیان بە ئەستۆ بوو، کەسێك بەناوی "ئینارۆس* ***Inaros***" *یان بۆ پاشایەتی هەڵبژارد. سەرەتا ئەم فەرمانڕەوایە دەستی بە کۆکردنەوەی سەربازی میسری کرد، ئینجا بڕیاری دا لە گەلانی تریش سەرباز بەکرێ بگرێ و بەم جۆرە سوپایەکی گەورەی سەربازی ئامادەکرد. هەروەها چەند نێردراوێکیشی رەوانەی ئاتین کرد، تاکو بەڵێنی هاوپەیمانێتییان لەگەڵ دا ببەستێ... و ئاتینییەکان کە بڕیاریان دابوو تاکو ئەو جێیەی لە دەستیاندا بێ هەوڵی ڕیسواکردنی ئێران بدەن، ... سێ سەد کەشتی جەنگییان بۆ یارمەتی دانی میسر رەوانەکرد*(٧٧).



لە دەورووبەری ساڵی ٤٥٧ی پێش زایین سوپای هاوپەیمانی میسر و ئاتین لە دەشتەکانی نیل رووبەڕووی سوپای ئێران بە سەرکردایەتی **هەخامەنیش**، کە برای **خەشایارشا** (و مامی **ئەردەشێر**) بوو، بوونەوە. بە یارمەتی هێزی جەنگاوەری هووپۆلیتەکانی یۆنانی یاخیبووانی میسر توانیان وا لە سوپای ئێران بکەن پاشەکشێ بکات. هەخامەنیش لەم جەنگەدا کوژرا. پاشان ئاتینییەکان بەخێرایی هێرشیان هێناو مەمفیێسیان داگیرکرد. بۆ ماوەیەکی کەم واپێدەچوو میسرییەکان توانیویانە بۆ هەمیشە لە ژێر دەسەڵاتی ئێران خۆیان رزگار بکەن.

ساڵێك دواتر مێگابیزی لێهاتوو بە سوپایەکی گەورە هات و بە سەختی یاخیبووانی شکست دا و ئینارۆسی بەدیل گرت. ئاتینەکان ناچاربوون لە بەرامبەر هێرشی بەرفراوانی ئێرانییەکان هەڵبێن و پەنابەرنە دوورگەیەك، کە لە نزیك نیل بوو. لەوێدا پاش یەك ساڵ بەرگریکردنی بێ هیوایانە و دلێرانە سەرەنجام شکستیان خوارد و نزیکەی دوو سەد کەشتی و چوار هەزار سەربازیان لە دەستدا. ئیمپراتۆری ئێران ئەمجارەیان میسری توندتر لە جاران لەناو دەست دا گرت.

**کزبوونی ئابووری**

**ئۆمستد** لە کتێبی **"مێژووی ئیمپراتۆری ئێران"** دا بەم جۆرە باسی ئەوە دەکات، کە چۆن زیادبوونیماڵیات و باج و پاشەکەوتکردنی زێڕ و ئاڵتوون و زیو، گرانی بەدواوەهات. بەم جۆرە رەهەندی لەسەرەخۆ، بەڵام بەردەوامی کزبوونی ئابووری ئێران بەرەو پێش چوو.

"بەردەوام لە ساتراپییەکانەوە لافاوی باری زیو بەرەو **[خەزێنەی ئیمپراتۆری]** دەهات... بڕێکی کەمی ئەم سامانە گەورەیە سەرلەنوێ دەگەڕاوە ناو ساتراپییەکان. واباوبوو کە ئاڵتوون و زیویان لە ئێراندا دەتواندەوە و کەلوپەلی جیاجیا یان خشتی زێڕ یان لێ دروست دەکرد. بڕێکی کەمی ئەو ئاڵتوونە، کە توابۆوە دەکرایە دراڤ. ئەمەش بەزۆری بۆ کڕینی سەربازانی دەرەکی یان بەرتیدان بە بەرپرسانی دەوڵەتانی بیانی بەکاردەبردرا. جا بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام زێڕو زیو بەرەو خەزێنەی ئیمپراتۆری دەهات، ئیمپراتۆری بە خێرایی تووشی کەمبوونی زێڕو زیو هات... تاکو ماوەیەك بابەتی متمانە دەیتوانی کارە بازرگانییەکان بەرەو پێش ببات، بەڵام... داواکردنی دراڤی زیو بۆ دانی باج، ژمارەی ئەو خاوەن زەوییانەی زۆر کردبوو، کە قەرزاربببوون یان تووشی ڕیبا خواردن ببوون... چونکە سککەکانی دراڤ لەلایەن ریباخۆرەکان و [هەروەها دەوڵەت] پاشکەوت کرابوو و کەمبوونەوە، بەهای بازاڕ بەرزبۆوە و بووە هۆکاری بەرزبوونەوەی زۆری بەهای کەلوپەلەکان و بارودۆخی ئابووری زۆر خراپتر و نالەبارتر کرد.

سەرکووتکردنی شۆڕش- کە رووداوێکی دەگمەن و چاوەڕواننەکراوی لەگەڵ دابوو، واتا شکستدانی سوپای یۆنان بە دەستی سەربازانی ئێران- گەورەیی ئەردەشێرو ئیمپراتۆرییەتی ئێرانی زۆرترکرد. بەڵام هێنانەئارای ئەم شکۆ و گەورەییە بەرهەمی کارامەیی و لێزانی مێگابیز بوو نەك ئیمپراتۆر. ئەوەی راستی بێ دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی ئێران بەسەر سنووره بەرفراوانەکەی تەنیا دەگەڕاوە بۆ بوونی سەردارانێکی بەتواناو لێهاتووی وەکو مێگابیز کە سەرکردایەتی سوپای سەربازییان بەئەستۆبوو. ئەویش تاکو ئەو دەمەی کە پەیڕەوو وەفاداری دەسەڵاتی ناوەندی بوون. خودی **مێگابیز** کە لەساڵی ٤٤٠ی پێش زایین شۆڕشی کرد، سەلماندی، کە بنەما کارەکییەکانی ئیمپراتۆری چەندە لاواز و بێ توانابووە[٧٨]. بە بەرەنگابوونەوە لە بەرامبەر ئەو سوپا سەربازییەی کە بۆ سەرکوتکردنی هاتبوون پیشانی دا، بێ بوونی ئەو دەسەڵاتی سەربازی ئێران چەندە لاواز و بێ توانایە. سەرەنجام ئەردەشێر مێگابیزی بەخشی و ئەم کارە لاوازبوونی سەرکردایەتی ئێرانی سەلماند، چونکە ئەگەر لە رۆژگاری داریووش و خەشایار بووایە، بێگومان مێگابیز لە سێدارە دەدرا.

لاوازبوونی دەسەڵاتی ناوەندی ئێران لە ڕۆژگاری جێنشینەکانیشی بەردەوامبوو. کاتێك فەرمانڕەوا لە ساڵی **٤٢٤**ی پێش زایین دوای ٤١ ساڵ دەسەڵاداری کۆچی دوایی کرد، ململانێکی نوێی دەسەڵات بۆ بەدەستهێنانی تاج و تەخت هاتە ئاراوە. سەرەتا خەشایارشای دووەم کە کوڕی ئەردەشێر بوو، هاتە سەر حوکم، بەڵام مانگێکی نەخایاند کوڕەکەی تری بەناوی سۆغدیان، خەشایار شای دووەمی کوشت و ماوەیەك پاش ئەوەش کوڕەکی تری بەناوی ئۆکووس (ئاخس) سۆغدیانی لەناوبردو لە ساڵی **٤٢٣**ی پێش زایین بەنازناوی داریووشی دووەم لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت. سەبارەت بە رۆژگار و شێوەی فەرمانڕەوایەتی ئەم ئیمپراتۆرە ناتوانین باسی بابەتێکی ئەوتۆ بکەین. لە رۆژگاری دەسەڵاتداریەتی ئەودا، کۆمەڵە شۆڕشێك بەرپابوون، کە زۆربەیان بە پشتیوانی سەربازانی بەکرێگیراوی یۆنانی بەڕێوە دەچوون. لە دیوانی فرمانڕەوایەتی دا ئارمانجە رەوشتییە مەزنەکانی رۆژگاری کورووش و داریووشی یەکەم لەناو لیخناوێکی خەست دا نقووم ببوو. رووداوی پیلانگێڕانی "**تێری تووکم** Teritucmes" ی زاوای نوێی پاشای گەورە بۆ وەدەستهێنانی تەختی فەرمانڕەوایەتی، ئەوپەڕی زێدەخوازی و بێبەزەییەك بوو، کە رەسەنزادە خانەدانەکانی ناودیوانی فەرمانڕەوایەتی تێیدا نقووم ببوون. کاتێك کە پیلانەکە سەری نەگرت تێری تووکم کوژرا و پاشان شاژن "**پاریساتیس** Parysotis" فرمانی دا دڵدارەکەی و سەرجەم خزم و کەسەکانی لەگەڵ ئەوەشدا کە بێ تاوانبوون، زیندە بەچاڵ بکەن.



## کورووشی بچووک و کارەساتی کوناکسا

کاتێك داریووشی دووەم لە ساڵی ٤٠٤ی پێش زایین مرد، دووبارە ململانێ بۆ بەدەستهێنانی تەختی پاشایەتی دەستی پێکردەوە. بەڵام ئەمجارەیان توندترین و مەترسیدارترین شۆڕشێك بوو، کە ئیمپراتۆری ئێران لەم بارەوە رووبەڕووی ببۆوە. **ئارساك** [**ئەرەشك** Araces] گەورەترین کوڕی داریووش لە شوێنی بابی هەڵبژێردرا و بەناوی ئەردەشێری دووەم دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت: کورووش کوڕی دووەمی داریووشی دووەم لەم هەڵبژاردنە زۆر ناڕازی بوو (ئەمە هەمان کورووش بچووکە کە یۆنانییەکان بۆ جیاکردنەوەی لەگەڵ کورووشی گەورە بەو ناوە ناویان بردووە)، چوار ساڵ بەر لەم پێشهاتە کورووش بە هۆی دەسەڵات و دەوری پاریساتیسی دایکی، کە بۆی لە ئەرەشك خۆشەویستر بوو، لە کاتێکدا کە تەمەنی نەگەیشتبووە شازدە ساڵ، سەرجەم ساتراپییەکانی ئاسیای بچووکی بۆ خۆی دانابوو. ئەم پلەوپایە دەبووە هۆی ئەوە تاکو دەسەڵاتی "**تیسافێرن** Tissapherns" ئەو حاکمە بەتوانایەی، کە چەندین ساڵ بوو بەوپەڕی تواناوە لەم ناوچەیە دەسەڵاتداری دەکرد، زۆر کەم بێتەوە.

ئێستا کە براکەی ببووە پاشاو لە پاسارگاد دا تاجی پاشایەتی دانابوو، کورووش یەکەمین هەوڵی خۆی بۆ بەدەستهێنانی تاج و تەخت خستەگەڕ. بوێرانە سەرەتا هەوڵی دا لە کاتی رێوڕەسمی دانانی تاج، ئەرەشکی برای بکوژێ. بەڵام ئەم هەوڵە سەری نەگرت. فەرمانڕەوای نوێ بڕیاری دا بەخێرایی کورووش لە سێدارە بدرێ، بەڵام پاریساتیس بەرەوانی کردو نەیهێشت فرمانەکە جێبەجێ بکرێ. بە پێی نووسینەکانی پلۆتارك لە ژیاننامەی ئەردەشێری دووەم، "ئەو [**پاریساتیس**] کورووشی لە باوەشی خۆیدا گرت و رووخساری رۆڵەکەی لەناو رەشماڵی قژی ئالۆزی داپۆشی، گەردنی بە گەردنی ئەو وەناو بەگریان و پاڕانەوەی زۆر تکای لە ئەردەشێر کرد لێی ببوریت و [بەم جۆرە] توانی گیانی ئەو [**کورووش**] دەرباز بکات[٧٩]" ئیمپراتۆر بێ ئەوەی مەیلی لێ بێت کورووشی بەخشی و دەرفەتی پێدا بەرەو ساتراپییەکانی رۆژئاوا، ساتراپییەکانی خۆی بوون بگەڕێتەوە.

بەڵام خولی رووداو و پێشهاتەکان سەلماندی بەخشینی ئەردەشێر کارێکی زۆر هەڵە بووە. کورووش هەرکە گەڕاوە دەستی بە دانانی پیلانی شۆڕشێکی گەورە کرد. لە ماوەی دوو ساڵدا سوپایەکی گەورەی سەربازی کۆکردەوە، کە پێکهاتبوو لە سەد هەزار سەربازی هەرێمی ساتراپەکانی ژێر فەرمانی خۆی و نزیکەی سێزدە هەزار بەکرێگیراوی یۆنانی. سەرکردەی

یۆنانییەکان سەردارێکی بە ئەزموونی ئیسپارتی بەناوی "**کلێارخووس** Clearchus" بوو. کورووش لە ساڵی ٤٠١ی پێش زایین هێزەکانی خۆی لە ڕێگەی کلیکیەو سووریەوە بەرەو باشوور و پاشان بەرەو ڕۆژئاوای ڕووباری فورات برد. وایدەزانی سوپای ئەردەشێری بەجێ هێشتووە، بەڵام لە "**کوناکسا** Cunaxa" شوێنێك کە دەکەوێتە نزیکەی دە کیلۆمەتری بابل، **داریووش** و **تیسافێرن** کورووشیان گەمارۆدا. بەپێی گەواهی **گەزنەفۆن** کە- لە ریزی سوپای **کلێنارخووس** بۆ کورووش دەجەنگا، سەرەتا سوپای شۆڕشگێڕان سەرکەوتنیان بە دەست هێنا، بەڵام فالانکسەکانی یۆنانی هێرشێکی توونديان بردە سەر سوپای ئێران:

*ریزەکانی هەردوو بەرەکەی جەنگ نزیکەی سێ سەد یان چوار سەد مەتر لێك دووربوون، کە یۆنانییەکان سروودی جەنگیان خوێندەوەو بەرەو ڕووی سووپای دوژمن هێرشیان برد... ئینجا گشتیان هاواریان کرد "ئێلە لۆ، ئێلە لۆ!" و دووکەس دووکەس شان بە شانی یەك بەرەو پێشەوە رۆیشتن... هاوکات بە رمەکانیان لە قەڵغانەکانیان دەکوتا تاکو ئەسپی [ئێرانییەکان] بترسێن و بیان ڕەوێننەوە. بەرلەوەی بارانی تیری ئێرانییەکان بە ئەوان [یۆنانییەکان] بگات، ئێرانییەکان پاشەکشەیان کردو هەڵاتن و یۆنانییەکانیش بەدوایان کەوتن... بەڵام هاواریان دەکرد: "رامەکەن، رێزەکانی خۆتان تێك مەدەن!"(٨٠)*

کورووش کە دڵی بە هێرشی سەرکەوتووانەی یۆنانییەکان خۆش کردبوو و بەخۆشی سەرۆکایەتی سەربازانی سوارچاکی لە ناوبەندی سوپا بە ئەستۆوە بوو، بوێرانە هێرشی بردە سەر سوپای ئەردەشێر. بەوپەڕی دلاوەریەوە لە نێوان رێزە بەهێزەکانی سوارچاکی دوژمن تێپەڕی و خۆی گەیاندە ئەردەشێر و سەرکەوتووانە هاواری کرد "**ئێستا پیاوێك دەبینم!**" بەرلەوەی ئەردەشێر خۆ بجوولێنێتەوە، کورووش رمێکی تێگرت و براکەی لەسەر پشی ئەسپ کەوتە خوارەوە. بەڵام سوارچاکانی پاسەوانی ئەردەشێر هیچ دەرفەتێکیان بە کورووش نەداو بەخێرایی بەسەریان دادا و کوشتیان. ئەردەشێر کەبە سووکی بریندار ببوو بە تیسافێرنی گووت، سەرجەم سەربازەکان هێرشبەرنە سەر سوپا سەربازییە ناوچەییەکانی کورووش. هێزەکانی کورووش، کە زانیان سەرکردەکەیان کوژراوە بەخێرایی و بە پەلەپەل رایان کرد و پاشەکشەیان کرد. کلێارخووس و سەربازانی بەکرێگیراوی یۆنانی دەستیان بە هەڵاتن کردو لەو جەنگە شکستخواردووەدا گیانی خۆیان دەرباز کرد.





**یۆنانییەکان و ئێرانییەکان لە جەنگێکی رووبەڕوودا لە کوناکسا لە نزیك بابل لە ساڵی ٤٠١ ی پێش زایین. شکستی یۆنانییەکان لە پاش ئەم جەنگە رێپێوانی بەناوبانگی "دە هەزار کەسی" لێکەوتەوە.**

## تێپەڕینی دە هەزار کەس

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك جەنگ لە نێوان سوپای سەربازی گەورەی ئێران و سەربازانی کەمی یۆنانییەکان راوەستا. ئینجا دوای وتوویژێکی سەرەتایی، تیسافێرن بە پیلانێکی فێڵبازانە کلێ ئارخووس و سەرکردەکانی تری بانگەشەکرد تاکو بەژداری لە کۆنفرانسێکی ئاشتی بکەن و لەم کۆنفرانسەدا گشتیانی کوشت. یۆنانییەکان بە بیستنی ئەم ئیهانەکردنە ناپیاوانەیە، هەستان بە هەڵبژاردن و دانانی فەرماندەیەکی سەربازی تازە کە گەزنەفۆنیش یەکێك لەم فەرماندانەبوو. لە ئەنجامدا بڕیاریان دا بەرەو وڵاتی خۆیان بگەڕێنەوە، بەڵام هەروەك دواتر **گەزنەفۆن** نووسیویەتی، ئاگاداری ئەو مەترسیانە بوون، کە لەسەر ڕێگادا تووشی دەهاتن:

*"دوای ئەوەی کە فەرماندەکان گیران و لەگەڵ ئەفسەرو پاسەوانەکانیان کوژران، یۆنانییەکان زۆر... شێوان. لە راستیدا ئەوان لە بارەگای پاشای ئێران لە هەموو لایەکەوە لەلایەن هێزەکانی سەربازی، هۆز و شارەکانی گەمارۆ درابوون... کەس کەلوپەلی پێویست و خۆراکی نەدەدانێ. زیاتر لە ١٥٠٠ کیلۆمەتر لە وڵاتی خۆیان واتا یۆنان، دووربوون کەچی هیچ کەسێکیشیان لەگەڵ دانەبوو، کە شارەزای ڕێگە بێت و ڕێبەریان بکات. ڕووباری زۆر گەورەیان لە بەردەم دابوو و تەنانەت زۆربەی ئەو سەربازە ناوچەییانەی کە لەگەڵ کوروش هاتبوون ئەوانیان بەجێ هێشت بوو(٨١).*

یۆنانییەکان لەگەڵ ئەوەشدا دەیانزانی تووشی ئەم کێشەو بەربەستانە دەبن بەرەو باکووری ڕۆژئاوا بەڕێکەوتن و داستانی **"تێپەڕینی دەههەزار کەس"**یان تۆمارکرد، کە دواتر **گەزنەفۆن** لە کتێبی **"ئاناباسیس"** دا بە درێژی باسی لێوە دەکات. یۆنانییەکان پاش تێپەڕاندنی کۆسپ و تەگەرە و چەشتنی ئازارێکی زۆر، بەتایبەتی سەرماو سەهۆڵبەندان و تاڕادەیەکیش هێرشی بەردەوامی سوپا سەربازییەکانی ئێران و هۆزە کێونشینە دلاوەرەکان، خۆیان گەیاندە کەنارەکانی دەریای ڕەش و داوتریش گەیشتنەوە ماڵەکانی خۆیان. بەسەرهاتی دڵتەزێنی ئەمانەو سەرکەوتنی کۆتاییان لە ساڵانی دواتردا پەیوەندی سەربازی نێوان ئێران و یۆنانی خراپتر کرد. ئەمانە سەرەتا توانیان بسەلمێنن، کە تەنانەت سەربازە ئێرانییەکان لەناو دڵی ئێرانیشدا، بەرگەی هووپۆلیتەکانی یۆنانی ناگرن. جگە لەوە ئەگەر لەشکرێکی بچووکی سەربازانی یۆنانی دەیتوانی ئاوها ڕووبەڕووی هێزێکی گەورەی سوپای ئێران ببێتەوە، لە داهاتوودا کە ببنە خاوەن سوپایەکی گەورەو بەتوانا دەبێ چی بکەن؟ بۆ زۆربەی یۆنانییەکان ڕووداوەکانی کوناکساو دەرەنجامەکانی بوونە پەندێك بۆ ئەوەی بزانن لە داهاتوودا بە چ شێوازێك لەشکری ئێران شکست بدەن.

## ئیمپراتۆریەتێکی شڵەژاو و لاواز

جێگەی سەرسووڕمان نییە سیاسەتی ڕەسمی ئێران ئەم ڕووداوانەی بە جۆرێکی تر شی دەکردەوە. بە گوێرەی ڕاگەیاندنی پاشای گەورە، ئەو توانی بووی بوێرانە ڕووبەڕووی هێرشی بەرفراوانی سوپای یۆنان بۆ ناو خاکی وڵاتی خۆی ببێتەوە. بەڵام ئەردەشێر بەخۆی زۆرباش دەیزانی و بە چاوی خۆی هێرشە مەترسیدارەکانی هووپۆلیتەکانی یۆنانی لە کوناکسا بینی. دەیزانی، کە دەبێ ڕووبەڕووی هەڕەشەی هێرشەکانی یۆنانییەکان بۆ سەر ئیمپراتۆری خۆی ببێتەوە. کاتێك کە **"ئاگێسیلاووس Agesilaus"** لە ساڵی **٣٩٦**ی پێش زایین لە ژێر کاریگەری نووسینەکانی گەزنەفۆن هێرشی بردە سەر ساتراپییەکانی ئێران لە ئاسیای بچووك، ئەردەشێر بە ناچاری زێڕو ئاڵتوونێکی زۆری دا تاکو یەکێتییەك لە دەوڵەت- شارەکانی یۆنانی بەتایبەتی لە ئاتین و **"تێبێس Thebes"** دابمەزرێنێ، تاکو هێرش بکاتەسەر ئیسپارت. ئەم هێرشانە دەوری خۆیان گێڕاو ئاگێسیلائووس بە ناچاری وازی لەگرتنی ئەم ساتراپیانە هێناو دەستی بە بەرگریکردن لە وڵاتی خۆی کرد[٨٢]. ئینجا ئیمپراتۆری گەورە لە ساڵی **٣٨٧**ی پێش زایین بۆ مەبەستی بەدی هاتنی ئاشتی **"ئانتالسیداس antalcidas"** (ناسراو بە **"ئاشتی



شاهانە"**) هەنگاوێکی بەرزتری هەڵبڕی. زۆربەی دەوڵەتە گەورەکانی یۆنانی دانیان بەم ئاشتییە داناو واژوویان کرد. خاڵەکانی ئەم پەیماننامە ئاشتیخوازانەیە بەسوودی ئێران بوو: سەرتاسەری ئاسیای بچووك بەتایبەتی شارەکانی یۆنانینشینی ئیوونییە خرانە سەر سنووری ئیمپراتۆرییەتی ئێران. هاوکات ئیمپراتۆری گەورە دانی بەسەروەری نیشتمانی سەرەکی دەوڵەتەکانی یۆنانی دادەنا تاکو ئەوکاتەی لە رادەی سنووری خۆیان تێنەپەڕیبانە هیچ جۆرە دەستتێوەردانێکی لە کاروباری ناوخۆی ئەواندا نەدەکرد. ئێستا بۆ یەکەمینجار پاش چەندین ساڵ سنوورەکانی ڕۆژئاوای خاکی ئێران ڕووی ئاسودەییان بەخۆوە دەبینی، بەڵام ئەردەشێر لە ناوچەکانی تری سنووری ئیمپراتۆری خۆیدا ئاوها سەرکوتوو نەبوو. هەرچەندە دەسەڵاتی ناوەندی لاوازتر دەبوو، شۆڕش و سەرهەڵدانێکی زۆرتر ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و بەتایبەتی میسری دەگرتەوە. لەم بارودۆخەدا ئیمپراتۆری ئێران و هێزە جەنگییەکەی لە هەلومەرجێکی وا دانەبوون، کە بتوانن بە ئاسانی ئەم شۆڕشانە سەرکووت بکەن. ئەردەشێر نەیتوانی میسر بگرێتەوە. هەروەها لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە و شەڕکردن لەگەڵ هۆزە یاخیبووەکانی دەوروبەری دەریای خەزەر (قەزوین)، سەرسەختی و پێداگری و خۆڕاگری جەنگاوەرەکانی ئەم دەڤەرە ئەوەهابوو، کە ئیمپراتۆر بۆ ڕاگرتنی جەنگا ناچاربوو بەرتیل بە فەرماندەکانی ئەم هۆزە ناوچەییانە بدات.

بەم چەشنە کاتێك میراتی تاج و تەختی ئیمپراتۆرییەتی ئێران گەیشتە دەستی ئەردەشێری سێیەم (ئەردەشێری سێیەم دوای مەرگی باوکی لە ساڵی **٣٥٨**ی پێش زایین لە شوێنی باوکی دانیشت). بارودۆخی ئیمپراتۆرییەتی ئێران لە هەموو کاتێك شپرزەترو شڵەژاوتر ببوو[٨٣]. پاشای نوێ زۆر بە دژواری توانی سەرلەنوێ میسر بگرێتەوەو بەشێکی بەرفراوان لە ناوچەکانی سنووری ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەودا لە دەرەوەی دەسەڵات و کۆنترۆڵی ئێران دابوون بخاتەوە ژێر دەستی. بەرلەوەی بتوانی پلانی هێرشێکی نوێ بۆ گرتنەوەی دووبارەی ئەم ناوچە دابڕاوانە دابڕێژێت، بە دەستی یەکێك لە ڕاوێژکارەکانی بەناوی **"باگۆاس** (بەنج واس) Bagoas" کوژرا. باگواس جگە لە بچووکترین شازادە ئەوانی تریشی کوشت.

**سەرەنجام ئازادی**

**گەزنەفۆن** لە کتێبی **"ئاناباسیس"** وەسفی کاتێکی هەست بزوێن دەکات، کە پاشماوەی ماندووی سوپا دە هەزار کەسییەکە پاش چەندین مانگ رێپێوانی و ئازارو ناخۆشی گەیشتنە کەنارەکانی دەریای رەش و زانیان کە دەرباز بوون و گەیشتنەوە ولاتی خۆیان:

"[پاش ئەوەی رێپیشاندەر بەڵێنی پێدابین، کە رێگەی دەریامان پێپیشان بدات] لە رۆژی پێنجەم گەیشتینە بەردەم چیا... کاتێك یەکەمین کەس گەیشتە لووتکەی چیاو چاوی بە دەریا کەوت، لە هاواری دا. [من] و ئەفسەری راگری پشتەوەی ستوون وامانزانی دوژمن لە رووبەڕووە هێرشی بۆ هێناوین... بەلام کاتێك کە هات و هاوارەکان زیاتر و نزیکتربوون [هەواڵی خۆشی] وەکو دەنگی هەورە تریشقەیەك سات لە دوای سات بەرزتر بوو، هەموو پێکەوە لە هاواریان دەدا. زانیم دەبێ رووداوێکی زۆرگرنگ بێت. سواری ئەسپەکەم بوومەوە... و بە خێرایی بۆ یارمەتیدان بە رێکەوتم. زوو لە واتای ئەم هاوارو خۆشییانە تێگەیشتم. سەربازەکان هاواریان دەکرد ((دەریا! دەریا!)) ئەفسەری راگری ستوونیش بەخێرایی خۆی گەیاند و هێسترەکانیش خێراتر ببوون. کاتێك کە گشت سەربازەکان گەیشتنە سەر لووتکەی بەرزی چیا... فەرماندەو ئەفسەرو سەربازانی تر یەکتریان لە باوەش گرت و رووی یەکتریان ماچ کردو لە خۆشییان دەستیان بەگریان کرد."



**سەربازەکانی یۆنانی کە دواتر بە دە هەزار کەسەکە ناوبانگیان دەرکرد، کە گەیشتنە دەریای رەش دڵشاد بوون و خۆشحاڵی خۆیان بەم چەشنە پیشان دا.**



شازادەی گەنج و چارەڕەش ناوی **"ئارسێس** Arses" بوو، بۆ ماوەی کەمتر لە دوو ساڵ لەژێر دەستی **باگۆاس** دابوو و پاشان وەکو باوك و براکانی بە دەستی ئەم پیاوە کوژرا. ئینجا باگۆئاس یەکێك لە خزمە دوورەکانی هەخامەنیشی بەناوی کۆدۆمان کردە پاشا. کۆدۆمان هەرکە بووە فەرمانڕەوا نازناوی داریووشی سێیەمی بۆ خۆی داناو ئەوەندە زانا بوو، کە دەرفەت بەم پیلانگێڕە فەرمانڕەوا سازو فەرمانڕەوا کوژە نەدات، ئەویش بکوژێت. داریووشی سێیەم پێشدەستی کرد و باگۆاسی کوشت.

## فیلیپ، ئەسکەندەر و جیهاد دژی ئێران

جیاوازی سەرەکی فەرمانڕەوایەتی داریووشی سێیەم لەوەدا بوو، کە چارەنووس وای دانابوو دوایین ئیمپراتۆری دەسەڵاتی خانەوادەی هەخامەنیش بێت. چارەنووسەکەی زۆر دڵتەزێن بوو، چونکە بە پێچەوانەی ئەو چەند فەرمانڕەوایەی کە لە پێش ئەودا دەسەڵاتداربوون، کەسێکی بیرمەندو لەسەرخۆ و بەخشندە بوو. تەنیا بیری لە ئاوەدانی و بەختەوەری ولات دەکردەوە. ئەگەر بارودۆخ و هەلومەرجی ئێران لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەودا بەشێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە چووبا، لەوانەیە یەکێك لە فەرمانڕەوا شایستە و لێهاتووەکانی ئێران بوایە.

بەلام کاتێك کە داریووشی سێیەم بووە فەرمانڕەوا. بارودۆخی ئیمپراتۆرییەتی ئێران زۆر شپرزە و ئالۆزبوو. لەلایەك سەرجەم سەرداران و ساتراپەکان و بەرپرسەکانی تری ولات هەوڵیان دەدا، تاکو ولات و ئیمپراتۆرییەکەیان بپارێزن، بەلام لەلایەکی ترەوە بارودۆخێکی نوێ و پڕ مەترسی لە یۆنان بەدی هاتبوو. چەندین ساڵ بوو دەوڵەت- شارەکانی یۆنانی دژ بەیەك دەجەنگان بە چەشنێك، کە ئەوانیش وەکو ئێرانییەکان لاواز و بێ توانا ببوون. هاوکات نەیانتوانی بوو بەرگری لە خۆیان بکەن، بەرامبەر بە هێرشی مەقدوونییە کە دەکەوتە باکووری یۆنان. **مەقدوونییە** خاوەن فەرهەنگ و کلتوورێکی دواکەوتوو بوو. بۆ ماوەیەکی زۆر لەژێر کاریگەری کولتووری یۆنانی دابوو. لە ساڵی **٣٥٩**ی پێش زایین فەرمانڕەوایەکی بەتوانا و لە رووی سیاسیەوە زانا بەناوی **فیلیپی دووەم** لە مەقدوونییە بووە پاشا و مەقدوونییە بەخێرایی بووە هێزێکی گەورەی جیهانی. لە ساڵی ٣٣٨ی پێش زایین واتا دوو ساڵ بەر لەفەرمانڕەوایەتی داریووشی سێیەم، فیلیپ هێزی سەربازانی یەکگرتووی یۆنان بە سەرکردایەتی **ئاتین** و **تێبێسی** لە **خایرۆنیای** رۆژئاوای **تێبێس** بە سەختی تێك شکاند. دەوڵەتی یۆنانی رووخاند و ئەم ولاتەی خستە ژێر دەسەڵاتی مەقدوونییەوە.

کاتێك مەترسی **فیلیپ** بۆ ئێران ئاشکرابوو، کە ماوەیەکی زۆر لە سەرکەوتنەکەی بەسەر یۆنان دا تێنەپەڕیبوو و لەم کاتەدا خۆی بۆ هێرشبردنە سەر ئاسیا ئامادە دەکرد. ئەو شتەی کە بە فەرمی لە لایەن فیلیپەوە ڕاگەیێنرا ئەوەبوو، دەیەوێ تۆڵەی هێرشی داریووش و خەشایار بۆ سەر یۆنان بکاتەوە، کە سەد و پەنجا ساڵ لەمەوبەر رووی دابوو. بێگومان کاتێك فیلیپ لە ساڵی **٣٣٦**ی پێش زایین بە هۆی پیلانێك کوژرا، ئێرانییەکان ئاسوودە بوونەوە. بەڵام کە **ئەسکەندەر** لە شوێنی باوکی دانیشت ئەم ئاسوودەبوونە زۆر زوو نائارامبوونی لێکەوتەوە(*).



**یەکێك لە وێنە خەیاڵییەکانی ئەسکەندەری گەورە کە سواری "بۆسفالاس" ی ئەسپە شکۆدارەکەی بووە**

(*) هەندێ لە توێژەرانی ئێرانی (زەبیحی بەهرووز، د.محەممەد موقەددەم، ئەندازیار ئەحمەد حامی [لە کتێبی سەفەری ئەسکەندەری مەقدوونی بۆ ئێران گەورەترین درۆی مێژووییە]. ئەسلان غەفاری [لە کتێبی چیرۆکی سکەندەرو دارا] و بەم دواییانەش خاتوو پووران فەرۆخ زاد [لە کتێبی کارنامەی بەدرۆ] رایان وایە، ئالکساندەری مەقدوونی و ئەسکەندەری مۆغانی دوو کەسی جیانە. یەکەمیان هەرگیز نەیتوانی ئێران بگرێت و لە جەنگی رووباری گراینکووس کوژرا و ئەو کەسەی، کە داریووشی بەزاند کەسێتییەکی ئێرانی و دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ئەشکانییەو ناوی ئەسکەندەری مۆغانی بووە. پشتڕاستکردنەوەی ئەم راوبۆچوونانە لە ڕێگەی توێژینەوە زانستییەکانی دواییەوە دەبێت و ئەمەش ئەرکی توێژەرەکانە.((وەرگێری کوردی)).



**ئەسکەندەر** لە رووی هەمان خۆبەزلزانینەکانی **فیلیپ** و ورووژاندنەکانی پەروەردە فیکرییەکانی **ئەرستۆ** کە پێیدەگووت، ئەسکەندەر دەشێت یۆنانییەکان بەسەر بەربەرەکاندا سەرکەوێنێ، بڕیاری جەنگ لەگەڵ ئێران دەرکرد. ئەسکەندەر لە ساڵی **٣٣٤**ی پێش زایین لە تەمەنی **٢٢** ساڵی دا بە هێزێکی گەورەوە کە پێکهاتبوو لە **٣٢** هەزار سەربازی پیادەو پێنج هەزار جەنگاوەری سوارچاك، لە ڕێگەی **هێلێسپۆنت** (**داڕدانێل**) هێرشی بردەسەر ئاسیای بچووك. لە نزیك رووباری **گرانیکووس**، کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی **داڕدانێل** سوپای سەربازانی ئێرانی بە سەرۆکایەتی سێ ساتراپی ناوچەیی تێکشاند. ئینجا لە ڕێگەیەکی پێچاوپێچ تێپەڕی تاکو گەیشتە باکووری رۆژئاوای سووریا. لەوێدا لە شوێنێك بەناوی "**ئیسووس** Issus" خودی داریووش بە سوپایەکی زۆرەوە چاوەڕوانی ئەوبوو. لێرەشدا جارێکی تر ئەسکەندەر سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەگەرچی بە هۆی پلانە تاکتیکییە کاریگەرەکانی داریووش ئەم سەرکەوتنە هەرگیز بە واتای لە کارکەوتنی سوپای ئێران نەبوو. کۆی زەرەرو زیانەکانی یۆنانیان دەگەیشتە ٤٥٠ کوژراو چوار هەزار بریندار، کەچی ئێرانییەکان پازدە هەزار کوژراو و بریندار و دیلیان هەبوو. کاتێك یۆنانییەکان پێگەی سەربازی ئێرانیان گرت هاوسەری پاشای گەورە، منداڵەکان و دایکی بەدیل گیران، بەڵام ئەسکەندەر بە دڵنەرمی و ڕێزەوە هەڵسووکەوتی لەگەڵ دا کردن.

ئینجا ئەسکەندەر و داریووش چەند نامەیەکیان بۆ یەکتر نارد، کە ئاریانی مێژوونووسی یۆنانی لە گوزارشی هێرشی ئەسکەندەر بۆ ئێران دەقی نامەکانی گواستۆتەوە. **داریووش** بۆ **ئەسکەندەری** نووسی:

*"ئەسکەندەر هیچ نێردراوێکی بۆ دیوانی [من] نەنارد، تاکو جەخت لەسەر هاوڕێیی و هاوپەیمانێتی دێرینی نێوان ئەم دوو ئیمپراتۆرییەتە بکات. بە پێچەوانەوە بەهێزە چەکدارەکانی هێرشی کردە سەر ئاسیاو زەرەرو زیانێکی زۆری بە ئێرانییەکان گەیاند. لەبەر ئەوە [من] بۆ مەبەستی بەرگریکردن لە وڵاتەکەم و تاج و تەختی باب و باپیرانم ڕێگەی جەنگم گرتەبەر... ئێستا داریووشی شا داوا لە ئەسکەندەر شا دەکات هاوسەر، دایك و منداڵەکانی بنێرێتەوەو پێی باشە هاوڕێ و هاوپەیمانی ئەو بێت. لەمروەوە [من] بە ئەسکەندەر ڕادەگەیێنم و چەند نێردراو و نوێنەرێك... لەلایەن خۆیەوە بۆ لای من بنێرێ تاکو کارە سەرەتاییەکان بۆ متمانە پێك کردن ئەنجام بدرێ."*

**ئەسکەندەر** بەم جۆرە وەڵامی **داریووشی** دایەوە:

*"باب و باپیرانی تۆ هێرشیان کردە سەر یۆنان و وڵاتی ئێمەیان تووشی زەرەرو زیان و وێرانی کرد. ئەگەرچی هیچ شتێکی وامان نەکردبوو تاکو ئەوان تووڕە بن. من وەکو سەرکردەو سالاری سەرتاسەری یۆنان هێرشم کردە سەر ئاسیا، چونکە دەمەوێت ئێرانییەکان لەبەر ئەم کارەیان سزا بدەم... سەرەتا سەردارەکان و ساتراپەکانی ئێوەم شکست دا. ئێستاش بەسەر خودی تۆو ئەو سوپا سەربازییەی، کە سەرکردایەتییەکەی بە ئەستۆی تۆیە زاڵبومە. بە یارمەتی پەروەردگار من فەرمانڕەوای وڵاتی ئێوەمە و خۆم بە بەرپرسیاری گیانی سەربازانی سوپای تۆ کە هەڵاتوونەو پەنایان بۆ من هێناوە، دادەنێم. ئەوان بە زەبروزەنگ بە دیل نەگیراون، بەڵکوو سەربەست بوونە و بە ئارەزووی خۆیان هاتوونەتە ژێر دەسەڵاتی من. جا بۆیە هەر بەو جۆرەی کە دەبێ برۆیە خزمەت فەرمانڕەوای ئاسیا، وەرە لای من... و لە داهاتوودا ئەگەر ویستت نامەم بۆ نێری، بە ناونیشانی فەرمانڕەوای سەرتاسەری ئاسیا ناوم بێنە. وەکو کەسێکی هاوپلەوپایە نامەم بۆ مەنێرە... ئەگینا وەکو تاوانبارێك هەڵسووکەوتت لەگەڵدا دەکەم(٨٤).*

**جەنگ لە لێواری رووبار**

**ئاریان** لە کتێبی **ئاناباسیس** لە ساتەوەختەکانی سەرەتای جەنگی گرانیکووس دەدوێت و پیشانی دەدات لە سەرەتادا ئەسکەندەر رووبەڕووی خۆڕاگری و دلاوەری سوپاکانی ئێران دەبێتەوە:

"هەردوو لەشکرەکە لە لێواری رووبار، بێ جوولە راوەستان بە جۆرێك کە تووشی حەپەسان بووبن، لەناو بێدەنگییەکی کپ و مەنگدا، مابوونەوە. ئینجا ئەسکەندەر... لە پێشەوەی باڵی راستی سوپا، لە کاتێکدا کە زوڕنای جەنگ لێدەدرا و هات و هاوارەکانیان دەگەیشتە گوێی خواوەندی جەنگ، هەوڵی دا لە رووبارەکەوە تێپەڕێت... ستوونەکانی پێشەوەی [سوپاکەی]... هەرکە دەگەیشتنە ئەوبەری رووبارەکەوە لە لایەن ئێرانییەکانەوە تیرباران دەکران. ئێرانییەکان سەنگەری خۆیان لە کەنارەکانی رووبار دامەزراند بوو. جەنگ بەشێوەی رووبەڕووبوونەوەی سەرباز بە سەرباز بەڕێوە دەچوو. یۆنانییەکان لەگەڵ ئەوەشدا، کە رووبەڕووی بەرگری توندی ئێرانییەکان ببونەوە بۆ ئەوەی لە رووبارەکە تێنەپەڕن، سەرەنجام تێپەڕین. رمە سووکەکانی سەربازانی ئێرانی بەخێرایی تێدەپەڕین و رمە درێژەکانی سەربازانی یۆنانی دەئاخنرایە ناو لەشی ئێرانییەکان و دەیخستن. لە سەرەتای جەنگدا لەناو ریزی سوپای سەربازانی ئەسکەندەر، یۆنانییەکان زەرەرو زیانێکی زۆریان لێکەوتەوە، چونکە ژمارەی سەربازانی ئێرانی زۆر بوون... ئینجا جەنگی هێزی سوارچاکان لەتەك تاکتیکەکانی سەربازانی پیادە دەست پێکرا: ئەسپ لە بەرامبەر ئەسپ، سەرباز لە بەرامبەر سەرباز، تێکهاڵان و یۆنانییەکان گشت توانای خۆیان خستەگەڕ تاکو دوژمنیان... لە پشتەوەی لێواری رووبار... لە کارخست... کەچی ئێرانییەکان هەروا دەجەنگان... و هاواریان دەکرد تاکو دوژمنان بخەنە ناو رووبارەکەوە.



**ئەسکەندەر و سەربازەکانی لەکاتی جەنگی خوێناوی کەناری رووباری گرانیکووس**

## دوایین هەڵسووکەوتی مەردانەی داریووش

داریووش پێشتر رێگەی دژواری جەنگان لەگەڵ ئەسکەندەری تاقی کردبۆوە، ئێستا لەناو قسەکانی ئەودا هەستی بە رِق و کینەو دوژمنایەتی و خۆبەزلزانینی ئەسکەندەر دەکرد. فەرمانڕەوای گەورە بە خێرایی سوپایەکی تری کۆکردەوە. لەگەڵ ئەوەدا ناچار بوو تامی تاڵی ئیهانەکردنێکی تر لەلایەن ئەسکەندەرەوە بچێژێ. یەکێك لەم ئیهانەکردنانە چوونی سەرکەوتووانەی ئەسکەندەر لە ساڵی **٣٣٢**ی پێش زایین بۆ ناو میسر بوو. لەوێدا میسرییەکان پاش نزیکەی دوو سەدە ژێر دەستی و ملکەچبوون و سەردانواندن لە بەرامبەر دەسەڵاتی ئێران، وەکو رزگارکەرانی نیشتمان پێشوازییان لە یۆنانییەکان کرد. ساڵێك دواتر ئەسکەندەر بە

سوپایەکی گەورەتر، کە پێکهاتبوو لە چوار هەزار سەربازی پیادە و حەوت هەزار سوار، لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو ناوەندی ئێران بەڕێکەوت.

لە سەرەتای ئۆکتۆبەر ( ناوەڕاستی ڕەزبەر) ی ساڵی **٣٣١**ی پێش زایین لە **گۆرگمێل** کە چەند کیلۆمەترێك لە باشووری ڕۆژهەڵاتی وێرانەکانی شاری **نەینەوا** پایتەختی **ئاشوور** دووربوو، داریووش بە سەرکردایەتی هێزێکی سەربازی کە لە سەد هەزار کەس پێکدەهات، هەروەها یەکە سوارچاکەکانی سەکایی و بەڵخی و نزیکەی دوو سەد عارەبانەی جەنگی و پازدە فیل خۆی بۆ جەنگی کۆتایی ئامادەکردبوو. جەنگ بەهێرشی ڕاستەوخۆی ئەسکەندەر لەگەڵ سوارچاکە کارامەو بە ئەزموونەکانی، بۆ شوێنی داریووش گەیشتە لووتکەی خۆی. بەپێی نووسراوەکانی **(پێلۆتارك)** سوارچاکانی پاسەوانی خودی **داریووش:**



**سەربازەکانی لەشکری ئەسکەندەر لە پاش هاتنی سەرکەوتوانەیان بۆ ناو وڵاتی میسر، لە دەوروبەری ئەبووڵهوولی گەورە کۆبوونەتەوە.**



*بە هۆی هێرشی توندی سوارچاکانی ئەسکەندەر ترسان و تۆقان... ئێستاکە خودی داریووشیش گشت ترس و تۆقانی ناو مەیدانی جەنگی لە پێش چاوان دابوو. ئەو هێزانەی کە بۆ پاڵپشتیکردنی لە ناوەندی سوپاکە دانرابوون، بەرەو پشتەوەی پاڵدران... پاشا بە بینینی ئەم کارەساتە لە عارەبانەکەی دابەزی، زریکەی داکەند و سواری ماینێك بوو... و مەیدانی جەنگی بەجێهێشت و هەڵات*[٨٥].

کاتێك هەواڵی هەڵاتنی داریووش گەیشتە ریزەکانی سوپا، ئەوانیش لاسایی سەرکردەی خۆیانیان کردەوە. ئەسکەندەر پاش ئەم سەرکەوتنە گەورەیە چەند کیلۆمەترێك بە شوێنی داریووش دا ڕۆیشت. ئینجا فەرمانڕەوای یۆنان ڕێگەی خۆی گۆڕی و بەرەو ناوەندی نیشتمانی ئێران واتا فارس ڕۆیشت. لە کاتێکدا کە هەزاران کەس لە ئێرانییەکان تۆقاو و حەپەساو و بێ پاڵپشت و پشتیوانێك سەیری ئەویان دەکرد، زۆربەی بیناو کۆشکە شکۆدارەکانی تەختی جەمشیدی سووتاند و وێرانی کردن.

ئەسکەندەر لە ژوەن ( جۆزەردان) ی ساڵی **٣٣٠**ی پێش زایین بەرەو شوێنی داریووش ڕۆیشت، کە لەسەر ڕێگەی **بەلخ** لەلایەن "**بێسووس** Bessus"ی ساتراپی بەلخ و بەرپرسە پایەبەرزەکانی تری ئێرانی بەند کرابوو. بێسووس بەشێوەیەکی قانوونی خۆی بە پاشای گەورە دانابوو و دەیویست لە بەرامبەر پاداشتێکی گەورەوە فەرمانڕەوای بەندکراو بداتە دەستی ئەسکەندەر. بەڵام کاتێك کە بیستی فەرمانڕەوای یۆنانی واتا ئەسکەندەر نزیك کەوتۆتەوە، تۆقا، بە ڕمێك داریووشی بە سەختی بریندارکرد و خۆی هەڵات.

لەوانەیە کەمتر لە کاتژمێرێك دواتر یەکێك لە سەربازانی ئەسکەندەر بەناوی "**پۆلیستراتووس** Polystratus" کە دوای گەڕانێکی زۆر بۆ دۆزینەوەی داریووش، تینوو ببوو، لەنزیك جۆگەلە ئاوێك ڕاوەستا تاکو کەمێك ئاو بخواتەوە. لەم کاتەدا چاوی بە کەژاوەیەکی سەرپۆشراو کەوت کە کەسی لەسەر نەبوو و لەوێ ڕاگیرابوو. دەنگی ناڵەناڵێکی لاواز لەناو کەژاوەکەوە دەبیسترا. کاتێك پۆلیستراتووس لێی نزیك کەوتەوە، داریووشی بەختڕەشی بینی کە بە زنجیر بەستراوەتەوەو لەناو خوێندا گەوز دەخواتەوە، لە کاتێکدا تەنیا سەگە بەوەفایەکەی

لەتەکی بوو. فەرمانڕەوا بە ناڵینێکی لاواز چۆڕێك ئاوی لێ ویست و پۆلیستراتووسیش ئاوی پێدا. ئینجا داریووش دەستەکەی تری ئەم پیاوەی گرت و بە ئاستەنگی پێی گووت: "ئەمە دوایین کارەساتی چارەنووسی ڕەشی منە، کە تۆ خزمەتم پێ بکەی و من نەتوانم وەڵامی ئەم خزمەتکردنەت بدەمەوە، بەڵام ئەسکەندەر پاداشتی ئەم دڵەنەرمییەی تۆ دەداتەوەو لە خوا دەپاڕێمەوە لەبەر ئەم ڕەفتارە پەسندو شیاوەی، کە ئەسکەندەر لە بەرامبەر دایك و هاوسەرو منداڵەکانمدا هەیبوو پاداشتی باشی بداتەوەو چاکەی بۆ بێنێت. من لە ڕێگەی تۆوە دەستم دەخەمە ناو دەستی ئەو.[٨٦]" ئینجا داریووش بە دەربڕینی ئەم پەیڤە مەردانەو جوامێرانەیە دوایین هەناسەی دەرکرد و کۆچی دوایی کرد.

کاتێك هەواڵی مەرگی داریووش گەیشتە شووش و ئێکباتان و ئەو شوێنانەی تەختی جەمشید کە خاپوور نەکرابوون، کۆمەڵانی خەڵکی دەستیان بە شین و گریان کردو جل و بەرگی خۆیانیان دڕی. ئەم خەڵکە بۆ کەسێك دەگریان و شینیان دەگێڕا، کە پیاوێکی هۆشیار و بیرمەند و پاك بوو، کە بەرلەوەی بتوانێ توانایی خۆی پیشان بدات، لەناوچوو بوو. هەروەها لە شتێکی تریش دەترسان ئەویش ئەوەبوو، کە مەرگی فەرمانڕەواکەیان ئەنجامێکی خراپتر و بارودۆخێکی ناخۆشتری بۆ ئەوان بە دواوە بێت. ئێستا پارسەکان ڕووبەڕووی هەمان ئەو ڕاستییە تۆقێنەرە ببوونەوە، کە مادەکان و بابلییەکان و ئەوانی تر زۆر پێشتر تووشی هاتبوون. ئیمپراتۆرییەتی گەورەی هەخامەنیشی تووشی هەمان ئەو چارەنووسە ڕەش و خراپە هاتبوو، کە گشت تێکۆشەرانی مرۆڤایەتی بە هەموو تواناکانیانەوە، بە ناچاری تێیدا بەژدار بوونە: پاڵدران بە هۆی شەپۆلەکانی مێژوو بۆ ناو تاریکایی لە بیرچوون و باوەشی بەردەوامی [مێژوو].

# دوا وته

## برینە سارێژنەکراوە دێرینەکان
## ئێران لە ڕێڕەوی تێپەڕینی سەدەکاندا

لە ماوەی تێپەڕینی سەدەکانی دوای ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ئێران، نیشتمانێك کە ڕۆژگارێك لەژێر فەرمانڕەوایەتی هەخامەنیشییەکان دابوو، کەوتە بەر هێرشی گەل و هۆزە جیاجیاکان و ئیمپراتۆرییەتە جیاجیاکان. دەسپێکی ئەم هێرشانە واتە هێرشی ئەسکەندەر کە ئێرانی ڕووخاند، هەم بەرفراوانترین و هەمیش کەم خایەنترینی ئەم دەسەڵاتانە بوو و تەمەنی کورت بوو. ئەسکەندەر دوای گرتن و سزادانی **بێسوس** بە تاوانی کوشتنی داریووش سەرتاسەری ساتراپییەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران بەتایبەت **پارت** و **بەڵخی** گرت و لە کۆتاییدا گەیشتە خاکی **هیندستان**[٨٧]. لەوێدا لە نزیك ڕووباری **"هیداس پێس** Hydaspes" (**جەهلوومی** ئێستا کە دەکەوێتە ویلایەتی **پەنجاب**) سوپای گەورەی هیندی تێك شکاند، بەڵام لە هیندستان دا چی تر بە دوای بەرفراوانترکردنی سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەی نەکەوت، چونکە سەربازانی ئەم سوپا گەورەیە بە هۆی ڕۆیشتنی بەردەوام و درێژخایەن پەکیان کەوتبوو و داوایان لێ کرد بگەڕێتەوە. ئەسکەندەریش بێ ئەوەی مەیلی لێ بێت، بەدڵی ئەوانی کرد و کەمێك پاش گەیشتنی بۆ **بابل** لە ساڵی **٣٢٣**ی پێش زایین بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لە تەمەنی **٣٣** ساڵی دا (لەوانەیە بە هۆی نەخۆشی **مەلاریا**) کۆچی دوایی کرد.

بەڵام زۆری پێنەچوو ئەم سنوورە بەرفراوانە لێکترازا. کەمێك پاش مردنی ئەسکەندەر سەردارەکانی بۆ وەدەستهێنانی تاج و تەختی فەرمانڕەوایەتی لەگەڵ یەك بەشەڕهاتن، ئەم سەردارانە لە مێژوودا **"دیا دۆخی** Dia Docki" یان جێنشینەکانیان پێدەگووترێ. ئەم پیاوە زێدەخوازانە زنجیرە جەنگێکی وێرانسازیان دروست کرد، کە زیاتر لە ٤٠ ساڵی خایاند. سەرەنجام ئەم جەنگانە لە دەوروبەری ساڵی ٢٨٠ی پێش زایین سێ سنووری فەرمانڕەوایەتی لێکەوتەوە. گەورەترین سنووری فرمانڕەوایەتی لە لایەن **"سێلووکووس** Seleucus" ەوە دامەزرا و زۆربەی ناوچەکانی نیشتمانی ئێران و چەند بەشێکی خاکی **فەلەستین** و ئاسیای بچووکی دەگرتەوە.



ئیمپراتۆرییەتی سێلووکسیە لە ئێراندا وەکو دەسەڵاتە دروستبووەکانی تر، زمان و کولتووری یۆنانی لە سەرتاسەری ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاوکردەوە. بە هۆی ئاوێتەبوونی کلتوورەکانی ناوچەیی لەگەڵ کلتوور و هزرو داب و نەریت و ڕێوڕەسمی یۆنانی، کلتوورێکی دوو جەمسەری بەدی هات، کە زاناکان ((**هێلینی**)) پێدەڵێن. سێ سەدەی دوای مەرگی ئەسکەندەر سەردەمی هێلینی پێدەگووترێ. جێگەی سەرسووڕمانەکە لەماوەی ئەم ساڵانەدا ئێرانییەکان بە باوەشی کراوە زۆربەی لایەنەکانی کولتووری یۆنانیان وەرگرت کە باب و باپیرانیان بۆ لەناوبردنی جەنگابوون. لەم بارەوە **"چێستێر ئێستار"** دەنووسێت:

*ئیمپراتۆرییەتی سێلوکس بە تایبەتی هەوڵی ئەوە دەدات، تاکو چوارچێوەیەکی کولتووری یۆنانی لەناو سنووری دەسەڵاتی خۆیدا دابمەزرێنێ و وردە بورژوازی سەربەستەکان لە شارە تازە بیناکراوەکانی یۆنانی دا نیشتەجێ بکات... لە ئاسیای بچووك نزیکەی هەشتا ناوچەی کۆچەرنشین لەلایەن فەرمانڕەوایانی هۆزە جیاجیاکان دامەزرا و پۆلێك شاری یۆنانی لە سووریادا دروستکران. لەو ڕۆژگارەوە بەولاوە ئەم شارانەی ئاسیای بچووك تاکو سەردەمی هاتنی عەرەبەکان شێواز و ڕواڵەتێکی یۆنانییان هەبوو*[٨٨].

## پارتەکان، ساسانییەکان و عەرەبەکان

لەگەڵ ئەوەشدا کە کولتووری یۆنانی کاریگەرییەکی زۆر و بەهێزی لەناو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبوو، سیستەمە سیاسی و سەربازییەکانی ئەم دەسەڵاتدارە هێلێنییانە دەورو تەمەنێکی کەمیان هەبوو. تەنیا چەند دەیە دوای دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی **سێلووکس (سلووکس)**، بۆ زاڵبوون و بە دەستەوەگرتنی ناوچە کۆنەکانی ئێران بەتایبەتی بانی خوارەوەی ئێران و ڕۆژهەڵاتی میزۆپۆتامیا تووشی کێشەو خۆڕاگری دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکان بوونەوە. لە ساڵی ٢٣٨ی پێش زایین هۆزە خێوەتنشینەکانی ئێرانی کە لە ئاسیای ناوەندییەوە بەرەو ئەوێ کۆچیان کردبوو، زۆربەی سنووری خاکی کۆنی ئێران بەناوی پارتیان داگیرکرد. سەرۆکەکەیان کە ناوی ئەرەشك بوو ئیمپراتۆرییەتی ئەشکانی دامەزراند و دەسەڵات و سنوورەکەی بەخێرایی بەرەو فراوانبوون ڕۆیشت و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سلووکسی بەدەستەوەگرت.

لە ساڵی ١٤١ی پێش زایین ئیمپراتۆرییەتی سلووکس بە تەواوی و بە یەکجاری کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی **ئەشکانی**. **پارتەکان** یان **ئەشکانییەکان** زیاتر لە سێ سەدە

بەردەوام لە رەوشی گەشەسەندن و بەرەوپێشچوون دابوون. هۆکاری ئەم گەشەو پێشکەوتنەیان تاڕادەیەکی زۆر بۆ ئەوە دەگەڕاوە، کە دەکەوتە سەر رێگەی ((**جادەی ئاوریشم**)). جادەی ئاوریشم لەڕووی بازرگانییەوە جادەیەکی بەسوودو پڕبایەخ بوو. لە رێگەی ئەم جادەیەوە کەلوپەلی جوانکاری لە نیشتمانەکانی ڕۆژهەلات واتا لە چینەوە بەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەتی رۆما لە رۆژئاوا دەگواستراوە و ئەشکانییەکان لەم ناوەدا دەوری دەلاڵ و پێکهێنەری کارە بازرگانییەکانیان هەبوو. فەرمانڕەوایانی ئەشکانی پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی **چین** دا هەبوو. بەڵام لەگەڵ رۆمادا پەیوەندییەکی ئەوتۆیان نەبوو و جەنگی بەردەوامی نێوان ئەشکانییەکان و رۆمەکان و بەتایبەتی ناکۆکییەکانیان لەسەر ناوچەی ئەرمینیا بوو، ناوچەی ئەرمینیا کە لە رۆژگاری هەخامەنیشەکان یەکێك لە گرنگترین ساتراپییەکان بوو.

لە کۆتاییدا لە ساڵی **٢٢٤**ی زایینی دەسەڵاتی **پارتەکان** بەرەو کزبوون رۆیشت و **ئەردەوانی پێنجەم** دوایین فەرمانڕەوای **ئەشکانی** بە دەستی **ئەردەشێری بابەکان** سەرکردەی وڵاتی **پارس** [کە خەڵکی رەسەنی ناوچەکە بوو] کوژرا. **ئەردەشێر** کە یەکێك لە نەوەکانی (**ساسان**) بوو ئیمپراتۆرییەتی **ساسانییەکانی** دامەزراند. **ساسان** ڕیشسپی و پیاوێکی خانەدان ــ و **کاهینی پەرستگەی ئاناهیتا** ــ بوو. ئیمپراتۆرییەتی ساسانییەکان بە هۆی ناوی باپیرەی ئەردەشێر بە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی ناوبراوبوو و زیاتر لە چوار سەد ساڵ جڵەوی دەسەڵاتداری ئێرانیان لەدەست دابوو. بە پێی نووسراوی **جۆن کێرتیس**، ساسانییەکان:

> *پاش کەمێك بێدەنگی و وچان کە دەسەڵاتی سلووکیەکان و پارتەکان دروستیان کردبوو، خۆیان بە جێنشینی هەخامەنیشەکان دادەناو دەیانوویست جارێکی تر گەورەیی رۆژگاری ئەوان زیندوو بکەنەوە. ئەم بەرزە فڕیە، وای لە فەرمانڕەوایانی ساسانی دەکرد تاکو بەردەوام لەگەڵ رۆمەکان و پاشانیش بیزەنتییەکان لە جەنگ و ململانێ دابن، ئەو جەنگانەی و کە سەرتاسەری مێژووی دەسەڵاتی ساسانییەکان دەگرێتەوە... ئەردەشێر بۆ مەبەستی دامەزراندی دەوڵەتێك، کە بتوانێ پلانە گەورەکانی ئەو جێبەجێ بکات دەسەڵاتێکی چڕکراوی ناوەندی دەمەزراند، دروستکردنی دراوی باشتر کرد و ئایینی زەردەشتی کردە ئایینی فەرمی دەوڵەت*[٨٩].

کاتێك لە ساڵانی نێوان **٦٣٧** تاکو **٦٥١**ی زایینی هێزەکانی دوایین پاشای ساسانی بەناوی **یەزگێردی سێیەم**، لە بەرامبەر هێزەکانی **ئیسلام** و کە بەوپەڕی ئیمان و ئایینباوەڕییەوە لە



رێگەی هێرشبردنە سەر ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و **باکووری ئەفریقیا** دەستیان بە جیهادکردن کردبوو، شکستی خوارد، رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ساسانییەکان لەپڕ کۆتایی پێ هات. دەورو کاریگەری ئایینی و کولتووری ئیسلامی کە لەم سەردەمەدا رێگەی کەوتە ناو وڵاتی ئێران، تاکوو ئەم رۆژگارەش هەروا لەم وڵاتەدا بەهێز و بەردەوامە.

بە تێپەڕینی رۆژگار کۆمەڵە کولتوورو ئیمپراتۆرییەتێکی تر بەسەر ئێراندا زاڵبوون و کاریان تێکرد و کاریان تێکرا. لە سەدەکانی یازدەم و دوازدەمی زایینی [پێنجەم و شەشەمی کۆچی] تورکە **سەلجووقییەکان** هێرشیان کردەسەر ئێران و شیرازەو بناغەی پێکهاتەیەکی کارگێڕی و ئابووری بەهێزیان دارشت، ئەمش تاڕادەیەك تاکو سەدەی بیستەم بەردەوام بوو. لە سەدەی شازدەمی زایینی [دەیەمی کۆچی] **شا ئیسماعیل** ئیمپراتۆرییەتی **سەفەوی** دامەزراند. دەوری گرنگی ئەم پاشایە گەڕاندنەوەی یەکێتی و یەکپارچەیی خاکی ئێران پاش تێپەڕینی ماوەیەکی زۆر بوو. (ئەگەرچی ئیتر ئێران وەکو رۆژگاری ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنیشی بەرفراوان نەبوو). لە سەدەکانی دوایی دا کۆمەڵە دەسەڵاتێکی بچووکی هەرێمی و کە دەسەڵاتەکیان لە سنووری بانی ئێران تێنەدەپەڕی، بەدی هاتن و لەناوچوون.



**نەخشێکی هەڵکەنراوی زۆر نایاب کە لە سەر پێخۆرێکی زیوی نەخشێنراوە، لەم نەخشە هەڵکەنراوەدا ئیمپراتۆری ساسانی لەکاتی راوکردنی شێر پیشاندراوە. راوکردنی شێر یەکێك لە بابەتە باوەکانی بواری هونەری رۆژگاری ساسانییەکان بوو.**

## ئێران لە چەرخی تازەدا

دەوڵەتی نوێی ئێران دوای **جەنگی یەکەمی جیهانی** و بە فەرمانڕەوایەتی **ڕەزا شای پەهلەوی** دامەزرا. گەشەی بە پیشەسازیی نوێ داو سیستەمی قانوونی وڵاتی بە شێوازێکی نوێ ڕێکخستەوە. "**محەممەد ڕەزاشا**"ی پەهلەوی کوڕی "**ڕەزا شا**" لە ساڵی ١٩٤١ی زایینی (١٣٢٠ی هەتاوی ) لە تەمەنی ٢٢ ساڵی بە پشتیوانی سەرکردە ڕۆژئاواییەکان دەسەڵاتی وەرگرت. پاشان دەستی بە بەرنامەی نوێخوازی کرد، کە ((**شۆڕشی سپی**)) پێدەگووترێ. چاکسازی لە شێوەی خاوەندارییەتی زەوی و بەرەو پیشەسازی چوون بەخێرایی ڕوویاندا. ئەو بەرنامانەی کە سەرمایەکەی لە ڕێگەی فرۆشتنی سەرچاوە بە پیتەکانی نەفتییەوە دابین دەکرا. فەرمانڕەوا بە لێدانی جاڕی نیشتمانپەروەری و شانازیکردن بەڕابردوو، شانازی بە فەرمانڕەوایان و ئیمپراتۆریەتی هەخامەنیشی دەکرد. لە ساڵی ١٩٧١ی زایینی (١٣٥٠ی هەتاوی) ئەم پاشایە زیاتر لە **سێ سەد ملیۆن دۆلاری** بۆ بەڕێوەبردنی جەژنەکانی ٢٥٠٠ ساڵەی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنیشی تەرخانکرد[٩٠]، سینگی خۆی داپێشێ و خۆی بەجێنشینی سەردەمیانەی کورووشی گەورە داناو لە مەراسیمێکی شکۆدار لەسەر گۆڕی کورووش ڕێوڕەسمی سوێندخواردنی بەرپاکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئێرانییەکان هەستیان بەوەکرد بەرنامە بەرزەفڕەکانی پاشا، کۆمەڵە گۆڕانێکی لە ڕادەبەدەر خێرای لە وڵاتدا بەدی هێناوە. ئەم گۆڕانانە دەرفەتی بەوەداوە تاکو کاریگەری و دەوری باڵای وڵاتانی ڕۆژئاوایی، ئێران بەرەو ((بۆگەنی)) ببەن. لە ساڵی ١٩٧٨ی زایینی (١٣٥٧ی هەتاوی) **محەممەد** ڕەزا شا بەناچار بۆ ڕاگرتنی ئارامی، قەدەغەبوونی هاتووچۆی ڕاگەیاند و چەند مانگ دواتریش خۆی هەڵات و ئێرانی بەجێهێشت. سەرکردەی شۆڕشگێڕەکان کە "**ئایەتوڵڵا خومەینی**" بوو، کەسایەتییەکی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی بوو و سەرۆکایەتی شۆڕشێکی گەورەی بە ئەستۆگرت. ئەم شۆڕشە دامەزراندی دەوڵەتی **کۆماری ئیسلامی** لێکەوتەوە. سیستەمێکی دەسەڵاتدار، کە تێیدا بیرو هزرو داب و نەریت و ڕێوڕەسمی ڕۆژئاوایی دەرفەتی پێنەدەدرا. لەگەڵ ئەوەشدا کە **خومەینی** لە ساڵی ١٩٨٩ی زایینی (١٣٦٨ی هەتاوی) کۆچی دوایی کرد، پەیڕەوانەکەی هێشتاش لە ئێران دەسەڵاتیان بە دەستەوەیە. گاڵتەی چارەنووس و یان ناخۆشییەکەی لەوە دایە، ٢٥٠٠ ساڵ دوای هێرشەکانی داریووش و خەشایارشا بۆ یۆنان کە بووە هۆکاری دژایەتی نێوان ئەورووپاو ئاسیا، هێشتاش برینە کۆنەکان بەتەواوی سارێژ نەبوونە و کەلێنی بێ متمانەیی و لێکتر تێنەگەیشتن لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەروا وەك خۆی ماوەتەوە.



## پەراوێزەکان

**پێشەکی- ئایا یۆنان باش و ئێران خراپە؟**

1-Isocrates, panegyricus, in paul j.Alexander, ed., The Ancient World: To 300 A. D New York: Macmilian, 1963, p. 163.

2- Aristotle, politics, in The philosophy of Aristotle. Translated by A. E. Wardman and J. L Greed. New York: New American Library, 1963, pp. 389 -390.

3- A.T. Olmstead, history of the Persian Empire. Chicago: University of Chicago Press, 1948, P. viii.

4- Olmstead, Persian Empire, P. xi.

**بەشی یەکەم:**

- ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کۆن: چوار ڕێیانی کولتوورەکان

٥- واتای وشەی بەین والنەهرەین [Mesopotamia] ((نیشتمانی نێوان دوو ڕووبار))ە. بەڵام لە ڕووی مێژووییەوە بە سەرجەم ئەو ناوچە هەموارانەی نێوان دوو ڕووباری گەورەی دیجلەو فورات دەگووترێ، کە لە ماوەی هەزاران ساڵ گەل و هۆزی جیاجیای تێدا ژیاوە.

6- Chester G. Starr, A History of the Ancient World. New York: Oxford University Press, 1991, pp. 32-33.

7- " The assyrians," in Sir John Hackett, ed., Warfare in the Ancient World. New York: Facts On File, 1989, pp. 36-37.

8- Olmstead, Persian Empire, p. 31.

٩- سوارچاکانی ئێرانی، چ مادی چ پارسی، پێدەچێت لە لایەن نەتەوەکانی تر ڕێزیان لێگیراوە، چونکە گەلانی جیاجیای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە هۆی ناوانی ئەسپ لەلایەن ئەوانەوە ڕێزێکی زۆریان بۆ دادەنان. زۆربەی دەقەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە ئەسپیان دەگووت ((**ئەسپی ڕۆژهەڵات**)) (ئێران لە ڕۆژهەڵاتی میزۆپۆتامیایە). هەروەها یەکێك لە ناوە کۆنەکانی **عیبری** بۆ ئەسپ (**سووس**) بوو و لە وشەی ((**شووش**)) وەرگیراوە، کە ماوەیەکی زۆر پایتەختی ئێران بوو.

10- The Book of Nahum / 2: 1-10, 3: 1-3, in The Holy Bible. Revied Standard Version. New York: Thomas Neldon & Sons, 1962, pp. 720-730.

ناحووم پەیڕەوی ئایینی یەهوودی بوو و لە کۆتاییەکانی سەدەی حەوتەمی پێش زایین لە ناوچەی ماد ئەو شوێنەی کە دواتر پارسەکان لەوێدا دەسەڵاتیان وەرگرت، دەژیا. ئەو چیرۆکەی کە لە چاخی کۆن لەبارەی تاڵانکردنی نەینەوای پایتەختی ئاشوور لەلایەن ماد و بابلییەکان دەگێڕێتەوە، پێدەچێت لە بینەرانی رووداوەکەی بیستبێتی و لە رووی گێڕانەوە زۆر گرنگ و بەنرخە.

١١- سەرکەوتووان ئەوها سیمبوول و هێماکانی کولتووری خۆماڵی ئاشووریان لەناوبرد، کە کاتێك چەند سەدە دواتر گەزنەفۆن سەرباز و مێژوونووسی یۆنانی بەسەر وێرانەکانی پاشماوەی کۆشکەکانی نەینەوا تێپەڕی، شارەزایانی رێگەو رێپیشاندەرانی ئێرانی هاوڕێی نەیاندەزانی چ کەسانێك دامەزرێنەری سەرەکی ئەم شارەن.

12- Alessandro Bausani, The Persians: From the Earliest Days to the Twentieth Century. Transletd by J. B. Doone. London: Elek Books, 1971, p. 15.

13- Herodotus, The histories. Translatd by Aubrey de Selincourt. New York: Penguin Books, 1972, p. 70.

**بەشی دووەم:**

**ـــ کەسێکی بیرمەندو بەتوانا: کوورووشی گەورە ئیمپراتۆری دادەمەزرێنێ**

14- Bausani, The Persians, pp. 15-16.

15- Herodotus, The histories, p. 95.

16- Nick Sekunda, " The Persians" in Hackett, Warefare in the Ancient World, pp. 83-84.

17- Xenophon, Cyropadia, Vol. 2. Translated by Walter Miler. New York: Macmillian, 1914, pp. 135-137.



18- Herodotus, The histories, pp. 72-73.

19- Herodotus, The histories, pp. 78-79.

٢٠- نەناردنی سەرباز لە لایەن ئیسپارتەکانەوە بە هۆی ترس نەبوو، چونکە لە هیچ کەسێك نەدەترسان، بەڵام بە شێوەیەکی بنەڕەتی کەسانێکی گۆشەگیربوون. خەڵکێك بوون دەجەنگان. ئەوان شارەکانی ئیوونییەیان پێ زۆر دووربوو و پێیان وابوو، ئەوەندە بایەخەی نییە تاکو سەربازانی ئیسپارتی بە هۆیەوە تێ بچن.

٢١- مێژووەکانی هیرۆدۆت لاپەڕە ١٣٠. مەبەستی کورووش لە ((مەیدانی تایبەت)) لەناو شارەکای یۆنانی ئاماژەیەکی گاڵتەجاڕانەیە بە "Agorae" یان بازاڕ و شوێنی کڕین و فرۆشتنی یۆنانییەکانە. ئێرانییەکان لە رۆژگاری دێرینەکان دا لەم جۆرە بازاڕانەیان نەبوو و، بەشوێنێکی نەشیاو و نالەباریان دادەنا.

22- Olmstead, Persian Empire, p. 44.

٢٣- ئەو گوزارشە ماتەمبارە بەناوبانگانەی کە لەبارەی رووخانی بابل لە لایەن هیرۆدۆت (مێژووەکان)و گەزنەفۆن (کورووشنامە) نووسراون. هەروەها بەپێی نووسراوەکان کورووش دوای گەمارۆدانی شار ئاراستەی رووباری فورات دەگۆڕێ تاکو سوپا سەربازییەکان بتوانن لە رووبارەکەوە تێپەڕن، ئێستا بەدرۆ خراونەتەوە. لە راستیدا کورووش ئاراستەی بەشێکی رووباری دیجلەی گۆڕی تاکو بتوانێ شاری ئۆپیس بگرێ. پێدەچێت مێژوونووسانی یۆنانی، کە نزیکەی سەدەیەك دواتر یان زۆرتریش بەرهەمەکانی خۆیان نووسیبێ بەهەڵە وایانزانیوە ئەم تاکتیکە سەربازییە لە بابل بەڕێوەچووە.

24- Quoted in Olmstead, Persian Empire, p. 51.

25- Bausani, The Persians, p. 18.

26- Xenophon, Cyropadia, vol. 1, p. 11.

**بەشی سێیەم:**

27- Herodotus, The histories, p. 243.

٢٨- بە تەواوی ئاشکرا نییە کە کەمبووجییە لە کاتی تێپەڕینی لە بیابان کەشتی بەکاربردووە یان نا. بەپێی نووسراوەکانی هیرۆدۆت کەمبووجییە لەگەڵ ریشسپییەکانی ناوچە عەرەبنشینەکان کۆبۆوە و ئەوانیش بەکاروانی وشتر کە مەشکەی پڕ ئاویان هەڵدەگرت

پێداویستییەکانی سوپای ئێرانیان دابین کردووە. بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت کەمبووجییە لەم کاتەدا کەشتیی دروست کردووە.

29- Herodotus, The histories, p. 215.

30- Quoted in Andrew R. Burn, Persia and the Greeks: The Defrense of the West, c. 546-478 B. c. London: Edward, 1962, p. 90.

31- Quoted in Burn, Persia and the Greeks, p. 93.

32- Quoted in Burn, Persia and the Greeks, p. 94.

33-Percy Sykes, A history of Persia. 2 vols. 1915. Reprint, London: Macmillian, 1958m pp. 160-161.

34- Bausani, The Persians, pp. 21-22.

٣٥- نیشتمانی سەرەکی پارسەکان واتا پارس، بە ساتراپی دانەدەنرا. بۆیە باجی نەدەدا.

36- Herodotus, The histories, pp. 359-360.

**بەشی چوارەم:**

ـ فەرمانڕەواکان، خەڵکی ئاسایی و کۆیلەکان: ژیان لە ئێرانی رۆژگاری دێرین

37- Herodotus, The histories, p.97.

38- Bausani, The Persians, p.16.

39- Xenophon, Cyropadia, vol. 2, pp. 355-357.

40- Olmstead, Persian Empire, p. 77.

41- Herodotus, The histories, p.97.

42- Herodotus, The histories, p.98.

43- Xenophon, Cyropadia, vol. 2, pp. 193-195.

44- Quoted in Bausani, The Persians, p. 27.

45- Herodotus, The histories, p.98.

46- Herodotus, The histories, p.96-97.

47- Olmstead, Persian Empire, p. 117.



٤٨- ئەم پەروەردەکردنانە کە لەگەڵ داگیرکردنی وڵاتەکانی دەووروبەر لەلایەن داریووش و خەشایاری کوڕەکەی ناگونجێ، پێدەچێت بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەوان ((دراوسێکان))ی خۆیان لەگەڵ توێژەکانی تری سەرەوەی کۆمەڵگای ئێرانی بەیەك ئاست دانەدەنا. لەم روویەوە چونکە بیانییەکان پلەیان نزمترە لە ئێرانییەکان، کەواتە پێویست ناکات وەکو دراوسێ هەڵسووکەوتیان لەگەڵ دابکرێ.

٤٩- بەپێی ریوایەتێکی رەسەنی مەسیحی، لەکاتی لەدایکبوونی مەسیح سێ کەس لە مۆغانی ئێرانی ((لە رۆژهەڵات))ەوە هاتنە سەر سەرینی مەسیحی تازە لەدایکبوو و کۆمەڵە دیارییەکیان بۆی هێنا. وێنە هونەرییەکانی دواتری ئایینی مەسیح، بۆ نموونە ئەوانەی کە لە دەخمەی گۆڕستانەکانی رۆمای کۆن (سەر بە سەدەی دووەمی زایینی) دۆزراونەتەوە، ئەم موغانەمان پیشان دەدەن، کە جل و بەرگی تایبەت بە ئێرانییەکانیان لەبەردایە.

**بەشی پێنجەم:**

ـ توانایەکی گەورەی بە ئاکام نەگەیشتوو: خەشایارشا رووبەڕووی یۆنانییەکان دەبێتەوە.

٥٠- شوێنەوارناسەکان لەناو گلکۆی ئیسکێتەکان کەلوپەل و جام گۆزەی زۆر ناسك و جوانیان دۆزیوەتەوە.

51- Herodotus, The histories, p. 310.

52 - Herodotus, The histories, pp. 312-313.

53- John Warry, Warfare in the Classical World. Norman: University of Oklahoma Press, p 1995, p. 25.

54- Herodotus, The histories, p. 379.

55- Herodotus, The histories, p. 382.

٥٦- هیرۆدۆت باسی ئەوە دەکات، کە چۆن جگە لە یازدە کەشتی نزیکەی شەست کەشتی لە بەرەی جەنگ لە ساموس هەڵاتن. ئەفسەرانی ئەم یازدە کەشتییە (( بەپێچەوانەی فرمانی فەرماندەکانیان، خۆیان راگرت و شەڕیان کرد)). زۆری نەخایاند کە زۆربەیان، بە خزمەتکارەکانی ناو کەشتییەکانیشەوە لەناو مەیدانی جەنگ تێچوون. چەندین ساڵ دواتر

دەوڵەتی ساموسییەکان بۆ مەبەستی ڕێزگرتن و یادکردنەوەیان بینایەکی بیرئانینی بۆ سازکردن.

57- Herodotus, The histories, pp. 394-395.

58- Herodotus, The histories, p. 403.

59- Herodotus, The histories, p.424.

٦٠- دیلەکان ڕەوانەی ئێران کران و لە ناوچەیەکی دوورەدەست نیشتەجێ کران، کە دەوروبەری پەنجا کیلۆمەترێك لە شاری شووش دوور بوو. پاش زیاتر لە پێنج سەدساڵ، واتا لە سەدەی یەکەمی زایینی، ئاپۆلۆنیۆسی تیانیایی، بلیمەت و گەڕیدەی یۆنانی سەردانی ئەم ناوچەیەی کرد. چاوی بە نەوەکانی ئەم ڕاگوێزراوانە کەوت کە تاکو ئەوکات بەزمانی بابوباپیرانیان دەدوان و بیرەوەرییەکانی زێدی باپیرانیان لەیاد دابوو.

61- Herodotus, The histories, p. 429.

62- Herodotus, The histories, p.441.

63- Quoted in Burn, Persia and the Greeks, p. 278.

64- Quoted in Herodotus, The histories, p. 444.

65- Herodotus, The histories, pp. 457-458.

66- Herodotus, The histories, p. 454.

67- Herodotus, The histories, p. 457.

68- Herodotus, The histories, p. 459.

٦٩- ئەم بەراوردکردنە لەلایەن مێژوونووسانی نوێ و شارەزایانی بواری سەربازییەوە ئەنجام دراوە. ئەو ژمارانەی هیرۆدۆت بە دەستەوەیان دەدات بریتیە لە: ١٧٥٠٠٠٠ سەربازی پیادە، ١٠٠٠٠٠ سەربازی سوارچاك، ٥١٠٠٠٠ مەلەوان و زیاتر لە دوو ملیۆن کارمەندی پێگەکانی سەربازی کە گشتیان زۆر خەیاڵین و لەگەڵ توانابیەکانی ئەوکاتی گواستنەوەی سوپایەکی ئەوها بە ڕاستی ناگونجێ.

70- Herodotus, The histories, p. 464.

71- Herodotus, The histories, p. 504.



72- Diodorus Siculus, Library of History, vol. 4. Translated by Charles L. Sherman and C. Bradford Welles. Cambridge, MA: Harvard University Press, 1963, pp, 139-141.

73- Herodotus, The histories, p. 541.

74- Quoted in Aeschylus, The Persians, in Aeschylus: Prometheus Bound, The Suppliants, Seven Against Thebes, The Persians. Transleted by Philip Vellacott. Baltimore: Penguin Books , 1961, p. 134.

75- Quoted in Herodotus, The histories, p. 557.

٧٦- یەکێتی دێلۆس، کە کۆنفیدراسیۆنی "دێلۆس"یشی پێگووتراوە، لەم ڕووەوە ئەو ناوەی پێدرا، کە کۆنگرەی یەکەمی دەوڵەتەکان لە دوورگەی بچووك و پیرۆزی دێلۆس بەڕێوەچوو. ئەم دوورگەیە لە ڕووی ستراتیژییەوە کەوتبووە ناوەندی دەریای ئیژەوە.

**بەشی حەوتەم**

ــ سێبەری کەمڕەنگی ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە: لاوازبوون و ڕووخانی ئێران

77- Diodorus, Library of History, p. 311.

٧٨- مێگابیز بە هۆی ئەو ڕفتارە توندەی کە لەگەڵ ئەو ئەسیرانەدا کرا کە لەکاتی هێرشکردنی بۆ میسر گرتبوونی، شۆڕشی کرد. ئەم سەردارە سوێندی بە شەرەف خواردبوو، کە گیانی ئیناروس و سەردارەکانی تری یۆنانی بپارێزێ و نەیانکوژێ. لەگەڵ ئەوەدا ئیمپراتۆر لە ژێر فشاری زۆری ئامێستریس بڕیاری مێگابیزی ڕەچاونەگرت و فرمانی دا ئیناروس لە خاچ بدرێت و یۆنانییەکانیش بکوژرێن.

79- Plutarch, Artaxerxes, in Lives of the Noble Grecians and Romanse, Published complete as Plutarchs Lives. Translated by John Dryden. New York: Random House, 1932, p. 1,252.

80- Xenophonm, Anabasis, published as The March Up Country. Translated by W. H. D. Rouse. New York: New American Library, 1959, p. 38.

81- Xenophonm, Anabasis, p. 66.

٨٢- ئاگسلاووس بەوەوە گاڵتەی پێکراوەو بەناوبانگ بووە، کە ئەردەشێر بە ((دە هەزار تیرهاوێژ)) ئەوی لە ئاسیا دەرکرد. بەپێی نووسراوی پلۆتارك مەبەست لەم گاڵتەپێکردنە ئاماژەیەکە بەو راستییە کە لەوکات نەخشی تیرهاوێژێك لەسەر دراڤی ئێران هەڵکەندرابوو.

Lives of the Noble Grecians and Romanse, excerpted in Plutarch: The Age of Alexander. Translated by Ian Scott-Kilvert: Penguin Books, 1973, p. 40.

٨٣- فەرمانڕەوای نوێ ئەوها لەبارەی ناڕێکی و شڵەژاوی دیوان و تاج و تەختی خۆیدا دڵنیگەران بوو، خێرا دوای بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات بۆ پێشگریکردن لە هەرجۆرە شۆڕش و یاخیبوونەوەیەك لەلایەن خزمە زێدەخوازەکانی، سەرجەم براو خوشکەکانی خۆی کوشت.

84- Arrian, Anabasis Alexander, Published as The Campaigns of Alexander. Translated by Aubrey de Selincort. New York: Penguin Books, 1971, pp. 126-128.

85- Plutarch, Artaxerxes, in Plutarch: The Age of Alexander, p. 291.

**دووا ووتە:**

ــ برینە سارێژنەکراوە کۆنەکان: ئێران لە ڕێڕەوی تێپەڕینی سەدەکاندا

٨٧- لەبارەی رەفتاری توندی ئەسکەندەر لەگەڵ بێسووس بڕوانە پلۆتارك، ئەسکەندەر، لاپەڕە ٣٠١-٣٠٠. و ئاریان، ئاناباسیس، لاپەڕە ٢١٢.

88- Starr, Ancient World, p. 407.

89- Qurtis, Ancient Persia, p. 61.

٩٠- خاڵی سەرەنجڕاکێش ئەوەیە کە ئەگەر لە ساڵی ١٣٥٠ ( ١٩٧١ )ەوە ٢٥٠٠ ساڵ بەرەو دواوە بگەڕێینەوە، دەگەینە بەرواری ٥٢٩ی پێش زایین کە هیچ ڕووداوێکی گرنگ لە رووی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی ئێران لە ئارادانییە، هۆکارەکانی هەڵبژاردنی ئەم ساڵە لە لایەن محەممەد رەزا شاوە دیارنییە.



## سەرچاوەکانی تر بۆ خوێندنەوەی زیاتر

Isaac Asimor, The freeks: Agread Adventure. Boston: Houghton. Mifflin, 1965.

کتێبێکی گشتی و سەرەنجڕاکێش و زۆرباشە، سەبارەت بە مێژوو و کولتووری یۆنان و پەیوەندی و جەنگەکانی لەگەڵ ئێراندا.

Peter Connolly, The Greek Armies. Morristown,NJ: Silver Burdeth,1979.

لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ لە بابەت چەك و تاکتیکەکانی جەنگی یۆنانییەکان بە تایبەتی ئەوانەی کە لە جەنگی ئێراندا بەکاربردراون. ئەم کتێبە کۆمەڵە وێنەیەکی رەنگی سەرەنجڕاکێشی تێدایە، کە لە لایەن "کانلی"یەوە کێشراونەتەوەو خوێندنەوەو بینینی ئەم کتێبە زۆر پێویستە.

Wichel W.Davison,ed, Everyday life Through the Ages. London Reader's Digest Associattion,1992.

ئەم کتێبە گەورەو پڕ وێنەیە کە توێژینەوەیەکە لە بارەی زۆربەی ئەو گەل و هۆزانەی کە لە سەرتاسەری مێژوودا ناسراون. بەشێکی ئەم کتێبە تایبەت کراوە بە ئێران، ئاشوور، بابل و یۆنانی کۆن.

Harold Lamb, cyrus the Great. Gardencity,NY: Dubleday. 1960.

کتێبێکی باش و نوێ سەبارەت بە ژیان و رۆژگاری کورووشی دامەزرێنەری ئیمپراتۆری هەخامەنیشی (کراوەتە فارسی) بەشێوازێکی راستگۆیانە وسادەو ڕەوان نووسراوە و هەم بۆ لێکۆڵەران و هەمیش بۆ خوێنەرانی ئاسایی بەکاردێت.

Hazel M.Martell, The Ancient world: From the Ice Age to the fall of Rome. Newyork: Kingfisher, 1995.

کتێبێکی شیاو و باشە و بەشێوەیەکی چڕوپڕ لە شارستانییەتە جیاجیاکانی رۆژگاری کۆنی کۆڵیوەتەوە، بەگشتی ئەو بابەتانەی لەبارەی ئێرانی کۆن لە کتێبی ئێمەدا ئاماژەیان پێکراوە، بەدرێژی لەمەدا، باسکراوە.

Don Nardo, Ancient Green. Sam Diego: Lucent Book, 1994. the Battle of Marathon. San Diego: Lucent Books, 1996; The Age of pericles. San Diego lucent Books, 1996; and Philip and Alexander the unification of greece. Newyork: franklin watts, fortheoming in 1998.

ئەم دوو کتێبە زانیاریەکی زۆر لە بارەی پەیوەندی نێوان ئێران و یۆنان لە یەکەمین پەیوەندی ئەم دوو نەتەوەیە لە سەدەی شەشەمی پێش زایین تاکو رووخانی ئیمپراتۆرییەتی ئێران بەدەستی ئەسکەندەری مەقدوونی، بە دەستەوە دەدەن.

## سەرچاوەکان

**سەرچاوە دێرینەکان:**

Aeschylus, The Persians, in Aeschylus: Prometheus Bound, The Suppliants, seven Against Thebes, The Persians. Translated by Philip vellacott. Baltmore: penguin Books, 1961.

ئاسخیلووس شانۆنووسی ئاتینی لە ساڵی ٥٢٤ی پێش زایین لە دایکبوو و بۆ ماوەیەکی زۆر بە یەکەمین شانۆنامەنووسی جیهان دادەنرا. زاناکان پێیان وایە، بەلایەنی کەم ١٨ شانۆنامەی نووسیوە، کە تەنیا حەوت دانەیان ماونەتەوە. شانۆنامەی ئێرانییەکان ( The Persians) سەبارەت بە سەرکەوتنی یۆنانییەکان بەسەر هێزی دەریایی ئێران لە سالامیس لە ساڵی ٤٨٠ی پێش زایینەوە تەنیا شانۆنامەیەکە، کە لە بارەی ئەم ڕووداوەوە بەشێوەیەکی واقعی و دوور لە ئەفسانە دەدوێت. گرنگتر لەمانە لە شانۆنامەدا وەسفی ئەو وردەکارییانە دەکرێت، کە خودی ئاسخیلووس تیایاندا بەژدارە. چونکە لە سالامیس (و دە ساڵ دواتر لە ماراتونیش) جەنگاوە. ئەگەرچی شێوەی نووسینی شانۆنامەکە شاعیرانەیەو بە زمانێکی دراماتیك نووسراوە، بەڵام وەسفکردنی بەرەی جەنگ وەکو بینەری ڕاستەوخۆی ڕووداوی مێژوویی تایبەتمەندییەکی زۆری هەیە.

Aristotle, Politics, in The philosophy of Aristotle. Translated\by A.E. Wardman and J.L. Greed. Newyork American Library, 1963.

ئەرستۆ فەیلەسووفی یۆنانی سەدەی چوارەمی پێش زایین کەسێتیەکی زاناو مامۆستای ئەسکەندەر بووە. کۆمەڵە کتێبێکی جیاجیای هەیە و بیروهزری ئەم فەیلەسووفە کاری کردە سەر هزری زاناکانی سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی ڕێنسانسی ئەورووپاوە. تەنانەت هەندێ لە بیروڕاکانی ئەرستۆ، ڕێگەیەکی ناڕاستەوخۆی بەسەر سەردەمی ژیانی ئێمەش دا هەبووە. کتێبی سیاسەت (Politics)ی ئەرستۆ، لە ئامانجەکانی دەوڵەت و پلەوپایەی بوونەوەری ئادەمیزاد لەناو دەوڵەتی کۆڵیوەتەوە و باسی ئەو تیۆرانە دەکات، کە ئەسکەندەری پێ پەروەردە کردووە: واتا هەندێ لە کۆمەڵانی ئادەمیزاد بەشێوەیەکی سرووشتی کۆیلەزادەنە و بەربەرەکان یان نائێرانییەکان لە ڕیزی ئەم خەڵکانەن. ئەسکەندەر لەژێر کاریگەری ئەم



بۆچوونەی ئەرستۆ لەبارەی پێویستی زاڵبوون و فەرمانڕەواییکردنی یۆنانییەکان بەسەر بەربەرەکان، بڕیاری دا  سوپا سەربازییەکانی بەرەو ئاسیاو گرتنی ئێران ببات.

Arrian, Anabasis Alexandri, Published as The Campaigrs of Alexander. Translated by Aubrey de Selincourt. Newyork: penguin Books, 1971.

ئاریان بە ڕەگەز یۆنانی بوو، کە لە دەوروبەری ساڵی ٩٠ی زایینی لە ویلایەتی "بی تینیا"ی ڕۆم لە ئاسیای بچووك لە دایکبوو. بەداخەوە زۆربەی بەرهەمەکانی، بەتایبەتی Indike سەبارەت بە پەیوەندی ڕۆمیەکان و یۆنانییەکان لەگەڵ هیندیەکان، ڕووداوەکانی پاش ئەسکەندەر (لە دە بەرگ) دا، و مێژووی بی تینیا، یان ونبوونە یان بەشێکی کەمیان لێ ماوەتەوە. مێژوونووسان بە هۆی ئەوەی، کە زانیارییەکانی کتێبی ئاریان بەناوی ئاناباسیس (کە نابێ لەگەڵ ئاناباسیسی گەزنەفۆن بەیەك دابنرێن، بڕوانە دواتر) تاڕادەیەکی زۆر بە پێی بینین و قسەکانی بەتەلیمووسی سەرداری ئەسکەندەر و ئاڕیستۆرلووس، کە یەکێك لە ئەندازیارانی ئەسکەندەر بوو نوسراوە و بەڕاست و دروست دادەنێن. [ئاریان کە نزیکەی زیاتر لە ٤٠٠ ساڵ دوای ئەسکەندەر ژیاوە چۆن و بە چ شێوەیەك ڕاستەوخۆ دەستی گەیشتۆتە قسەکانی سەردار یان ئەندازیاری ئەسکەندەر؟- و.]

Diodorus, Siculus, Library of History, Vol.4. Translated by charles L. Sherman and C. Bradford Welles. Cambridge, MA: Haward University prees, 1963.

دیۆدۆرووس بەرەگەز یۆنانی و خەڵکی سیسیل بوو. لە سەدەی یەکەمی زایینی (کاتێك سیسیل لەژێر دەستی ڕۆمەکان دابوو) لە دەورووبەری دەریای ناوەڕاست هەستابەسازدانی گەشتێك سازدا و کۆمەڵە بەڵگەو ریوایەتێکی زۆر کۆنی کۆکردەوە کە ئەمڕۆ لەناوچوونە. بەرهەمە گەورەکەی بەناوی کتێبخانەی مێژوو (کە بە مێژووی جیهانیش ناوبراو بووە) لە ڕاستیدا ٤٠ کتێب بوو کە نزیکەی ١٥ کتێبی ئەم کۆمەڵەیە تاڕادەیەك بەتەواوی لەبەردەست دانە. نزیکەی ١٠ کتێب تایبەت بە ساڵانی نێوان ٤٨٠ تاکو ٣٠٢ی پێش زایینە، کە زۆربەی جەنگەکانی ئێران و یۆنان و کزبوون و ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ئێران دەگرێتەوە. دیۆدۆرووس وەکو نووسەرێك، زۆر نارەسەن و کارنەزان بوو و بەردەوام هەوڵی دووبارەکردنەوەی بابەتەکانی داوە. بەزۆری بابەتەکانی دژیەکن. هەروەها هەندێجار سەرچاوەکانیشی جێگەی متمانە

نەبوونە. لەگەڵ ئەوەشدا مێژووەکەی گرنگە، چونکە باسی کۆمەڵە ریوایەتێك دەکات، کە لە شوێنی تردا نەهاتووە و لەوانەیە ڕاست بن.

Herodots, The Histories. Translated by Aubrey de Selineourt, Newyork: penguin Books, 1972.

هیرۆدۆت لە دەوروبەری ٤٨٠ی پێش زایین لە ئاسیای بچووك لەدایکبوو. هیرۆدۆت لە رووی کۆکردنەوەی زانیاری مێژوویی و هەروەها نووسینی کتێبێکی مێژوویی بەشێوەی پەخشان یەکەمین مێژوونووسی گەورەی ئەورووپییە، کە بەرەو سەرتاسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕۆیشتووە. ماوەیەکی زۆر لە ئاتین ماوەو سەرەنجام لەساڵی ٤٢٥ی پێش زایین لە ئیتاڵیا کۆچی دوایی کرد. مەبەستی سەرەکی و ناوەڕۆکی کتێبی مێژووەکان بریتیە لە راپۆرتی جەنگەکانی ئێران و یۆنان لە دەیەی ٤٩٠ تاکو ٤٧٠ی پێش زایین. (کە هیرۆدۆت پێی وایە گرنگترین رووداوەکانی مێژووی جیهان تاکو ئەو کاتە). بەڵام لە راستیدا کتێبێکی بەرفراوانە و کۆمەڵە شیکردنەوەیەکی لەبارەی بوارەکانی مەزەبی، داب و نەریت و تایبەتمەندیەکانی کولتووری و ئەفسانەکانی پۆلێك گەل و هۆزی تێدایە و بەشی هەرەزۆری تایبەت کراوە بە ئێرانییەکان، و بەم چەشنە ئەم کتێبە لەم رووەوە بە هەنبانەی زانیاری دادەنرێت. بەڵام سەرجەم ئەو بابەتانەی، کە لەم کتێبە دا ئاماژەی پێکراوە بە تەواوی راست و دروست نین. چونکە بەزۆری هەمان ئەو شتانەی، کە بیستوویەتی دووبارەی کردوونەتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیرۆدۆت بەرهەمێکی گەورە و وێنەیەکی ڕێکوپێك و پێکەوەلکاوی جیهانێکی کۆنی بەدی هێناوە. جێگەی بەختەوەرییە بە گوێرەی نەوەکانی دواتر، هیرۆدۆت کەسێکی زۆر وردبین و توێژەرێکی باش بووە و ئەوها بە روونی و دلڕفێنی بابەتەکانی خستۆتە بەردەست، کە سەرنجی خوێنەرانی بۆ خۆی رادەکێشێ. نازناوی ((باوکی مێژوو)) کە لە سەدەکانی دواتر بۆی دانراوە، بە راستی شایانی هیرۆدۆتە.

Isocrates, Panegyricus, in paul J. Alexander,ed, TheAncied world: To 300 A.D. Newyork: Macmillan.1963.

ئیسۆکراتێس لە دەورووبەری ساڵی ٤٣٦ی پێش زایین لەدایکبوو. ناودارترین و پایەبەرزترین کەسێتی ناو گرووپی وتارخوێنانی ئاتینی لە نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی پێش زایین بوو، کە بەردەوام دەوڵەت- شارە یۆنانییەکانی بۆ ئەوە بانگەشە دەکرد تاکو دژ بە ((بەربەرەکان))و بە تایبەت ئێرانییەکان یەك بگرن. کتێبەکەی کە لە ساڵی ٣٨٠ی پێش زایین



بڵاوبۆوە، بانگەشەکردنێکی گشتییە بۆ چەکهەڵگرتن. کتێبەکەی بەناوی "بۆ فیلیپ" کە لە دەیەی ٣٤٠ی پێش زایین بڵاوبۆوە ئامانجە سەرەکییەکەی روو بە فیلیپی دووەمی مەقدوونییە، کە دەیوویست دەوڵەتەکانی یۆنانی لەژێر ئاڵای فەرمانڕەوایەتی خۆیدا کۆبکاتەوە. مەرگی لەناکاوی فیلیپ لە ساڵانی دواتردا، ئەرکی هێرشبردنە سەر ئێرانی خستە ئەستۆی ئەسکەندەری کوڕی، کە خەونەکانی ئیسۆکراتێسی هێنایە دی و کۆتایی بە ئیمپراتۆرییەتی گەورەی هەخامەنیشی هێنا، کە زیاتر لە دوو سەدە دەسەڵاتداری یەکەم بوو.

Pultarch, Artaterxes, in live of the noble Grecians and Romans, excerpted in Plutarch: The Age of Alexander. Transleted by Ian scott-kilvert. Newyork: Penguin Books, 1973,and Published complete as plutarch’s Lives.Translated by John Dryden. Newyork: Random House, 1932.

پلۆتارك لە ساڵی ٤٦ی زایینی لە کرۆنای رۆژهەڵاتی یۆنان لە دایکبوو. ماوەیەك لە ڕۆما دادەنیشت و دەستکەوتەکانی پاڵەوانانی رۆمای ستایش دەکرد. ئەم کەسایەتیە مێژووییانە، کە زۆربەیان بە رەگەز یۆنانی و میراتگەری یۆنان بوون، بوونە بابەتی سەرەکی ژیاننامە گەورەکەی (کە زۆربەیان لە نێوان ساڵانی ١٠٥ تاکو ١١٥ نووسراون)و بە هۆی ئەم بەرهەمەوە ناوی دەکرد. پلۆتارك جگە لەوەی پابەندی رەوشت و ئاکاربوو، نووسەرێکی رەنگین خامەش بوو و بەرهەمەکانی زۆر رەنگاڵەو پڕە لە وردەکاری و وەسفی ورد و وێنەیی. گرنگترین ژیاننامەکانی ئەو کە پەیوەندییان بە کتێبی ئێمەوە هەیە بریتینە لە ژیاننامەی ئەردەشێری دووەم فەرمانڕەوای ئێران کە لەساڵی ٤٠٤ تاکو ٣٩٥ی پێش زایین دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی ئێرانی بەدەستەوەبوو. هەروەها ئەو رووداوانەی کە ((تێپەڕینی دەهەزار کەس))ی لێکەوتەوەو گەزنەفۆنی مێژوونووسی یۆنانیش لەناو ئەواندابوو. ژیاننامەی ئەسکەندەری گەورە کە ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنیشی لە سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی پێش زایین لەناوبرد و ژیاننامەی تێمێستۆکلێس، کسمیۆن، ناریستیدێس و ئاگسیلایووس.

Xenophon, Anabasis, Published as The March up Country. Translated by W.H.D. Rouse. Newyork: New American Library. 1959, Hellenica, Published as Ahistory of my Times. Translited by Rexwarner. Newyork: penguin Books, 1979;and Cyropaedia. 2Vols. Translated by Walted Miller. Newyork: Macmilan, 1914.

گەزنەفۆن لە دەوروبەری ساڵی ٤٢٨ی پێش زایین لە ئاتین لەدایکبووە و ژیانێکی پڕ رووداوی هەبوو. کاتێك گەنج بوو لە جەنگی کارەساتباری پۆلۆنزی، کەدەولەت- شارەکانی یۆنانی تێیدا لەناوچوون، بەژداربوو و هەروەها لە هاوڕێیان و لایەنگرانی فەیلەسووفی ناوداری یۆنانی سوقرات بوو. دواتر وەکو سەربازی بەکرێگیراو لە ئاسیادا جەنگاو لە ((تێپەڕنی قارەمانانەی دە هەزار کەسەکەدا)) بەژداربوو. راپۆرتی ئەم سەفەرە پڕ رووداوە لە کتێبی ئاناباسیس داهاتووە، کە یەکێك لە سەرەنجڕاکێشترین و هەستبزوێنترینی ئەو رووداوانەیە کە تاکو ئێستا لەم بارەوە نووسراوە و سەرچاوەیەکی بەنرخی زانیارییە لەبارەی ئێرانی ئەوسا. کتێبی "کورووشنامە"یان پەروەردکردنی کورووش (کە کراوەتە فارسی) کۆمەڵە زانیارییەك لەبارەی مێژوو و سیستەمی سەربازی ئێران بەدەستەوە دەدات. بەداخەوە کاتێك گەزنەفۆن وەسفی ئەو رووداوانە دەکات، کە خۆی تێیاندا بەژداربووە، هێشتا وەکو مێژوونوسێکی بە ئەزموون وکارامەی لیێ نەهاتبوو. بۆ نموونە لە کتێبی هێلێنیکا سەبارەت بە گەلە جیاجیاکان و سیاسەتەکانیان راپۆرتێکی مێژوونووسانەی وردی نییە. هەروەها لە کتێبی کورووشنامە هەندێجار رووداوە راستەقینەکانی مێژوویی ئاوێتەی ئەفسانەکراون و ئارەزووی ئەو بۆ بەرجەستەکردنی ئیمپراتۆرێکی ئایدیاڵ کتێبەکەی زیاتر بەرەو چیرۆکێکی مێژوویی دەبات، تاکو مێژووەکی وردو تەواو (بۆ نموونە لەم کتێبەدا کورووش لەسەر جێگاو بە هۆی دەردی پیری دەمرێت، کەچی لە راستیدا لە مەیدانی جەنگدا دەکوژرێ). لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کتێبەو کتێبەکانی تریشی هێشتا هەر باوەڕپێکراون.

**سەرچاوە نوێیەکان:**

Alesandro Bausani, The Persians: From the Earliest days to the Twentieth Century. Translated by J.B. Donne. London: Elek Books, 1971.

ئەم کتێبە بە هۆی ئەو زانیارییە گشتیانەی کە لە بابەت ئێرانی دوای رووخانی بەدەست ئەسکەندەر و بەتایبەتی ئیمپراتۆری سلووکی، پارتی، ساسانی، عەرەب، سەلجووقی، مەغۆل و سەردەمەکانی دواتر بەدەستەوە دەدات، سەرەنجڕاکێش و بایەخدارە.



Andrew R. Burn, Persia and the Greeks: The Defense of the West, C. 546-478 B.C. London: Edward Arnold, 1962.

ئەم کتێبە شارەزایانە باسی سەرهەڵدان و دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنیشی لە رۆژگاری کورووشی گەورە لە سەدەی شەشەمی پێش زایین دەکات. هەروەها باسی گرتنی شارەکانی ئیوونییە، شۆڕشی ئیوونییەو شکستەکانی دواتری و هێرشەکانی ئێران بۆ سەر یۆنان لە رۆژگاری ئیمپراتۆری داریووش و سەردارەکەی بەناوی داتیس و ئینجا خەشایاری کوڕی داریووش دەکات. کتێبەکە زۆر بە باشی نووسراوە و سوودی لە سەرچاوەی پڕ متمانە وەرگرتووە.

Jhon Curtis, Ancient Persia, Cambridge, MA: Harward University Press, 1990.

کتێبێکی بچووك بەڵام پڕ لە زانیارییە لەبارەی مێژووی ئێران، نەژاد، هونەر و میعمارییەکەی.

Peter Green, Alexander of macedon, 356-323 B.C: historieal Biography. Brekeley and Los Angleles: University of California press, 1991.

یەکێك لە باشترین توێژینەوەکان لەبارەی ئەسکەندەرە، کتێبێکی تێروتەسەل و توێژینەوەی مێژوونوسێکی زۆر ناودارە، کە کۆمەڵێك زانیاری راست و درووست لەبارەی ئیمپراتۆرییەتی ئێران لە کاتی رووخانی لە سەدەی چوارەمی پێش زایینی تێدا پۆلێن کراوە.

Peterb Green, The Greco-Persians wars. Berkeley and Los Angles: University of California press, 1996.

کتێبێکی تری پێتیر گرینە کە کۆمەڵێك بەڵگەو وێنەی تێدایە و بەشێوەیەکی سەردەمییانە پەیوەندییەکانی ئێران و یۆنانی راڤەکردووە و بەتایبەتی زۆر بەجوانی وەسفی هێرش و پێکدادانەکانی نێوان ئەم دوو سوپایەی کردووە.

Sir John Hacketh, ed, Warfare in the Ancient World. Newyork: Facts on File, 1986.

ئەم کتێبە پڕ لە زانیاری و باشە، بریتییە لە کۆمەڵێك نامەی تێروتەسەل، کە لەلایەن مێژوونووسانی گەورەی جیهانی نووسراوەو هەرکام لەمانە بەشێوەیەکی پسپۆڕانە و شارەزایانە لەبارەی گەشەی سەربازی و شێوازەکانی هەرکام لەگەڵ یان ئیمپراتۆرییە کۆنەکان دەدوێن. وێنە جوان و وردەکانی ناو ئەم کتێبە بەرهەمی دەستی هونەرمەندی زانای ناودار (پێترکانالی) یە. من بۆ نووسینی کتێبەکەم لەبارەی ئیمپراتۆرییەتی ئێران سوودم لە بەشی (ئاشوورییەکان) نووسینی (د.ج وایزمەن) وەرگرتووە و لە سیستەمی سەربازی میزۆپۆتامیا دەکۆڵێتەوە کە کتومت بەر لە ئێرانییەکان بووە و کاری کردۆتەسەر ئێرانییەکان. هەروەها وتارەکانی ((ئێرانییەکان)) نووسینی نیك سکۆندا، ((جەنگی هووپۆلیتەکان)) نووسینی جان لازنباری کە کورتکراوێکی زانایانەیە سەبارەت بە چەك و کەلوپەلی جەنگی و تاکتیکە سەربازییەکانی یۆنان، کە لە سەرووی ئەمانەی ئێران، بوون. هەروەها وتاری ((ئەسکەندەری گەورە)) نووسینی (ئالبێرت دیواین) کورتە باسێکی زۆر جوانی سەرجەم جەنگەکانی نێوان ئەسکەندەرو ئێرانییەکانە.

A.T. Olmsted, History of the Persian empire. Chicago: University of Chicago press, 1948.

بەرهەمێکی زانایانەو مامۆستایانەی تێروتەسەلە، کە بە زمانێکی سادەو ڕەوان و ناسك لە سەرجەم لایەنەکانی مێژووی ئێرانی کۆن، نەژادو نەتەوە، داب و نەریتی کۆمەڵایەتی، دەوڵەت، شێوازەکانی سەربازی، هونەر، میعماری و مەزهەبی، دوواوە.

Percy Sykes, A History of Persia. 2Vols. 1915. Reprint, London. Macmillan, 1958.

بەرهەمێکی بەنرخە ئەمڕۆ لە هەندێ ڕووەوە کۆن بووە، چونکە زۆربەی دۆزینەوەکانی شوێنەوارناسی هێشتا لەوکاتەدا ئەنجام نەدرابوون. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵە زانیارییەکی باش و بەنرخی تێدا دەست دەکەوێ.

John Warry, warfare in the classical world. Norman. University of Oklahoma press, 1995.

بەرهەمێکی جوانەو پڕ لە شێوەکاری، نەخش و نیگار و خشتەی وردو بەسوودە. ئەم کتێبە لە رووی پۆلێنکردنی ئەو زانیارییە تێروتەسەلانەی کە لەبارەی چەك، جل و بەرگ، کەرەستە، ستراتیژی و تاکتیکی جەنگی و سەرکردە سەربازییەکانی یۆنانی و ڕۆمایی و گەلانی تر کە لەگەڵ ئێران دەجەنگان، لە پلەی یەکەمی سەرچاوەکاندایە.



## ئەم کتێبەنانەش ئامادەدەکرێن بۆ چاپ:

١- چینی کۆن
٢- شۆڕشی فەرەنسا
٣- شۆڕشی کوبا
٤- چاخی دۆزینەوەکان
٥- سەدەی فیودالیزم
٦- ئیمپراتۆریەتی مەغۆل
٧- ئەمریکای دێرین
٨- شۆڕشی شکۆمەند
٩- ڕێنێسانسی ئیتالیا
٩- سەرهەڵدانی مەسیحیەت
١٠- گەشتەکانی مارکۆ پۆلۆ
١١- شارستانییەتی مایا
١٢- ڕووداوە گرنگەکانی مصری کۆن
١٣- ڕۆژهەلاتی نزیك - ی کەونار
١٤- ژاپۆنی ئەمڕۆ
١٥- مێژووی کۆیلەداری